# دوعا کلیلی بەختەوەریی

# لە دونیا و قیامەتدا



## دعاء مفاتح السعادة في الدنيا والآخرة

نووسینی:

قاسم محسن عولا

قاسم

باوکی شعیب

١٤٤٦ کۆچی

بسم اللّه الرحمن الرحيم

إن الحمد للّه نحمده ونستعينه ونستهديه ونستغفره، ونعوذ باللّه من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده اللّه فهو المهتدي، ومن يضلل فلا هادي له، وإن أصدق الحديث كلام اللّه، وخير الهدي هدي محمد ﷺ، وإن شر الأمور محدثاتها، وإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

الحمد للّه والصّلاة والسّلام على رسول اللّه، الحمد للّه رب العالمين، اللهمّ إنّا نعوذ بك من قلبٍ لا يخشع ومن نفسٍ لا تشبع، ومن علمٍ لا ينفع، ومن دعوةٍ يُستجاب لها، نسأل اللّه أن يوفقنا لكلّ خير، ويبعد عنّا كلّ شرّ، ويجنّبنا الشّيطان ويبعده عنّا وعن أهلينا، أمّا بعد :

قال تعالى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [البَقَرَة : ١٨٦]

قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ [غَافِر : ٦٠]



**بەلێ مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە بێ قەرارەیە کە تاوێك ناتوانێت ئارام بگرێت ، تاکو شوێنێکی ئارامی بەدەست نەکەوێت ، گەیشتنە بەم شوێنە ئارامە ، ئەویش گەرانەوەیە بۆلای (خوای گەورە ) دواکردن بە تەنها لە (خوای گەورە ) لە دوعاو پارانەوەکانمان بۆ گەیشتن بە مەنزلگای ئارامی دڵ ، هەروەها دەلیش کاتێك ئارام دەبێت سەرقالی زکرو یادی خوا دوعاو پارانەوەکانی دەبێت ،هەر وەکو (خوای گەورە ) دەفەرموێت** : قال تعالى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [البَقَرَة : ١٨٦]

**هەروەها (خوای گەورە) دەفەرمووێت** : قال تعالى: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ [الرَّعْد : ٢٨]

**بێ گومان ئێمەش لەم پەرتووکەدا بە چاکمان زانی دەربارەی دوعاو پارانەوە بدوێن ، لە چۆنیەتی تێ گەیشتن لە مانای دوعاو پارانەوە ، هەروەها مەرجەکانی دوعاو پارانەوە جۆرەکانی دوعاوپارانەوە لە گەل چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کە فێرمان دەکەن چۆن لە شوێن و کاتە جیاوازەکاندا دوعاو پارانەوە ئەنجام بدەین ، هەر بۆیە لە دوعاو پارانەوەکانمان دەبێت بەردەوام و بۆ هەمیشە داوای لێ خۆشبوون لە (خوای گەورە ) بکەین ، لە هەر گوناهو تاوانێك یان هەر هەلایەك و لە بیر چوونەوەیەك لەم پەرتووکە دا ، بەهیوای سوود بەخشن بێت بۆ دونیاو قیامەتی گەشت موسلمانان ...**



## پێناسەی دوعا :

**بریتیە لە زمانی خودەرخستن لەو پەری ملکەچی و نیازمەندی بە (خوای گەورە ) .**

**دوعا و پارانەوە  دوو جۆری هەیە :**

**١-دوعاو پارانەوەی پەرستن (العبادە ) : بریتیە لە باسکردن و پیاهەلدان بە (خوای گەورە) بەوەی خۆی باس و وەصفی خۆی کردووە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی بە شێوەی ترس داواو دلنیایی (الخوف والرجاء ).**

**٢-دوعاو پارانەوە ی پێویستیەکانی مرۆڤ (الدعاء المسالە ) :**

**أ-داواکردنی  هەموو ئەو شتانەی سومەندی ژیانی مرۆڤن  (جلب المنفعە ).**

**ب-داواکردنی لابردنی ئەو شتانەی کە زیامەندن بە مرۆڤ لە ژیاندا (دفع المضر ) بۆ دونیاو دوا رۆژ .**

**لە (ابن منظور )- رەحمەتی خوای لێ بێت - دەلێت : دوعا  (بریتیە لە  بانگ لێکردن و هاوار لێکردنی کەسێك).[1]**

**دەووترێت  : دوعا یان پارانەوە ، واتە: بریتیە لە مەیلکردنی شتێك بەروەو تۆ بە دەنگێك یان بە ووتەیەك ، کە لە تۆ دێت ، یان دەلێت : من بانگم بۆ فلان کەس کرد ، بە دوعایەك یان پارانەوەیەك بانگی دەکەم ، واتە: بانگم کردو داوای رازی بوونی یان قبول کردنیم لێ کرد ، یان دەووترێت : بە پارانەوەیەك بانگی (خوای گەورە ) دەکەم .**

**لە (ابن القیم ) - رەحمەتی خوا لێ بێت - دەلێت  :   دوعا ( بریتیە لە لە داوا کردنی شتێکی بە سوود بۆ داواکار وە لابردنی  ناخۆشی وە زەرەرو زیانێك لێی ) .[2]**

**یان دووترێت : دوعا ئەوەیە کە بەندە دوایی پێویستی خۆی لە پەروەردگاری خۆی دەکات .**

**لە (القاضي ابو بکر بن العربي ) - رەحمەتی خوای لێ بێت - دەلێت : (حقیقەتی دوعا یان پارانەوە ئەوەیە بانگەوازی کردنە لە (خوای گەورە ) بۆ بەدەستهێنانی سوودێك یان دوور کەوتنەوە لە زیانێك ) .[3]**

---

[1] -لسان العرب (٢٥٨/١٤).

[2] -بدائع الوفوائد (٣/٢)

[3] -مقدمة الترغيب في الدعاء والحث عليه ، عبدالغني المقدسی ص ٥٤.

## دوعاو پارانەوە لە قورئانی پیرۆز دا بە پێنچ شێوە هاتووە :

**یەکەم : (القول ) واتە: بە ووتە** : قال تعالى: ﴿دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾﴾ [يُونُس : ١٠]واتە : [ دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ ] لەناو بەهەشتدا دوعاو بانگ کردنی ئەمان ئەوەیە کە تەسبیحاتی خوای گەورە ئەکەن و بە پاك و مونەززەهی ڕائەگرن [ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ ] وە سڵاوی ئەوانیش سەلام کردنە هەندێکیان سەلام لە هەندێکیان ئەکەن، یان خوای گەورە سەلامیان لێ دەکات، یان مەلائیکەت سەلامیان لێ دەکات [ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٠) ] وە دوا پاڕانەوەشیان ئەوەیە ئەڵێن: حەمدو سەناو ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان لەسەر ئەم هەموو نازو نیعمەتانە..؟!

**دووەم : (العابدە) واتە: پەرستن** : قال تعالى: ﴿قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا﴾ [الأَنْعَام : ٧١]واتە : [ قُلْ أَنَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: ئایا ئێمە دوعا بکەین و بپاڕێینەوە لە جگە لە خوای گەورە لەو بت و شتانەی کە ئێوە ئەیانپەرستن کە نە سوودیان بەدەستە نە زیان، وە سوودو زیانی ئێمە بەدەست ئەوان نیە..؟!

**سێ یەم : (النداء) واتە: بانگ** : قال تعالى: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾﴾ [القَمَر : ١٠] واتە : [فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ (١٠) ] نوحیش - صلى الله عليه وسلم - لە خوای گەورە پاڕایەوە: ئەی پەروەردگار ئەوان زاڵ بوونە بەسەر منداو من توانای ئەوانم نیە تۆ تۆڵەیان لێ بسەنەو دینەکەی خۆت سەرخە..؟!

**چوارەم : (الاستعانة ) واتە : یارمەتی دان** : قال تعالى: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ﴾ [غَافِر : ٢٦] واتە : {فیرعەون موسا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - تۆمەتبار دەکات بە ئاشوبگێڕی} [ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ ] وە فیرعەون وتی: وازم لێ بێنن و لێمگەڕێن با موسی - صلى الله عليه وسلم - بکوژم و ئەویش با بانگی پەروەردگاری بکات ئەگەر ڕاست ئەکات با خوایەکەی بێت من بێباکم و گوێ نادەم و بەلامەوە ئاساییە..؟!

**پێنچەم : (السؤال ) واتە : دواکردن** : قال تعالى: ﴿فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا﴾ [البَقَرَة : ٦١] واتە : ئەی موسی تۆ دوعا بکە لە پەروەردگارت با لە زەوی بۆمان بڕوێنێ لە بەقل: ئەوەیە کە قەدی نیە وەکو سەوزەوات: نەعناو کەرەوزو کەوەرو هاوشێوەی ئەوانە...؟!

## صیغەکانی دعاو پارانەوە لە قورئاندا بە چەند صیغەیەك هاتووە :

**یەکەم : دوعا پارانەوە بە (فعل الامر ) واتە: بە شێوازی داوا کردن ، ئەویش بە صیغەی (أفعل ) ، (فَعِّل) ، (تفعَّل ) .**

**أ–صیغە (أفعل)** قال تعالى: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾﴾ [المُؤْمِنُون : ١٠٩] واتە : [ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا ] لە دونیادا کۆمەڵێك لە بەندە باوەڕدارەکانی من ئەیانووت: ئەی پەروەردگار ئێمە ئیمانمان بە تۆ هێناوە تۆ لێمان خۆشبەو ڕەحممان پێ بکە [ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ (١٠٩) ] وە تۆ باشترین خوای کە ڕەحم و بەزەیی بە باوەڕداران دەکەیت..؟!

قال تعالى: ﴿وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾﴾ [الإِسْرَاء : ٨٠] واتە : [ وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - کاتێك کە ڕۆیشتیتە مەدینەوە بڵێ: ئەی پەروەردگار چوونە ناو مەدینەم چاك و باش بێ، پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - کە ڕۆیشتە شاری مەدینە فەرمووی: (خوایە مەدینەمان لا خۆشەویست بکە هەروەکو چۆن مەکەت لا خۆشەویست کردبووین، یان زاتریش لە مەککە، وە تەندروستی بکەو بەرەکەتمان بۆ بخەرە کێشانەو پێوانەوەی) [ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ] وە کە لە مەککەش دەرکرام دەرکردنەکەیشم هەر چاك بێت و بەعیززەت و سەرکەوتنەوە بێت [ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا (٨٠) ] وە لەلایەن خۆتەوە حوجەو بەڵگەیەکی ئاشکرام پێ ببەخشە کە سەرم بخەیت و پشتیوانیم بکەیت..؟!

**ب–صیغە (فَعِّل)** قال تعالى: ﴿رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾﴾ [آل عِمْرَان : ١٩٣] واتە : [ رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا ] دەی پەروەردگار بۆ خاتری ئەو ئیمان هێنانەی کە ئیمانمان بەتۆ هێناو شوێن پێغەمبەرەکەت - صلى الله عليه وسلم - کەوتین لە تاوانەکانمان خۆشبەو بۆمانی داپۆشە [ وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا ] وە خراپەکانمان بسڕەوە [ وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ (١٩٣) ] وە لەگەڵ چاکەکاراندا بمانمرێنەو بمانگەیەنە بە پیاوچاکان ( ئەمە تەوەسول کردنە بەکردەوەی چاکی خۆت کە شەرعییەو دروستە) .

**ج–صیغة (تفعل )** قال تعالى: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾﴾ [البَقَرَة : ١٢٧] واتە : [ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا ] ئەی پەروەردگار ئەم کارە پیرۆزەمان لێ قبووڵ بکە کە دروست کردنی کەعبەیە [ إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٢٧) ] هەر تۆ بیسەرو وەڵامدەری دوعای وە هەر تۆ زۆر زانایت بە نیەتمان..؟!

دووه م : دوعا پارانەوە بە (مصدر النائب عن فعل الأمر )

قال تعالى: ﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ۝٢٨٥﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨٥] واتە : [ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) ] ئەی پەروەردگار تۆش لێمان خۆشبە وە مەصیرو سەرەنجام و گەڕانەوەی ئێمە هەر بۆ لای تۆیە..؟!

سێ یەم : دعاو پارانەوە بە (بأسلوب النهى )

قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ [البَقَرَةِ : ٢٨٦] واتە : [ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ] ئەی پەروەردگار هەر شتێك کە لەبیرمان کرد یان بەهەڵە کردمان تۆ لێمان مەگرە وە سزامان مەدە لەسەری، کە لە صحیح موسلیم هاتووە خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) ((مسلم) ٢٠٠ - (١٢٦)) واتە: بەڵێ ئەوە وام کرد هەر شتێك بە لەبیرچوون بێت یان بەهەڵەبێت موحاسەبەتان ناکەم و لۆمەتان ناکەم لەسەری و سزاتان نادەم [ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا ] ئەی پەروەردگار هیچ باری قورس و گران مەخەرە سەرشانمان هەروەکو چۆن خستە سەرشانی ئەو کەسانەی پێش ئێمە لە بەنی ئیسرائیل کە ئەوان بۆ تەوبەکەیان ئەبوایە یەکتریان بکوشتایە، وە شوێنێك کە پیسی بەر بکەوتایە ئەبوایە بیانبڕیایەو فڕێیان بدایە بە شۆرین پاك نەئەبۆوە، وە چەندەها باری قورس و گرانی تر کە خۆیان ئەیانخستە سەرشانی خۆیان، ئەی پەروەردگار ئەو بارە قورس و گرانانە مەخەرە سەرشانی ئێمە، دیسان خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) ((مسلم) ٢٠٠ - (١٢٦)) بەڵێ ئەوە هیچ بارێکی قورس و گران ناخەمە سەرشانتان [ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ] وە ئەی پەروەردگار هەر شتێك کە لە توانامان‌دا نەبوو مەیخەرە سەرشانمان وە داوامان لێ مەکە، خوای گەورە فەرمووی: (قَدْ فَعَلْتُ) ((مسلم) ٢٠٠ - (١٢٦))

قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ۝٨﴾ [آل عِمۡرَان : ٨]واتە : [ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا ] ئەمە هەر قسەی زانا چەسپاو و دامەزراوەکانە لە عیلمدا ئەڵێن: ئەی پەروەردگار دڵمان لە حەق لانەدەی بەوەی کە شوێن ئایەتی موتەشابیە بکەوین لە دوای ئەوەی کە هیدایەتی ئێمەت دا بۆ حەق [ وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٨) ] وە لە لایەن خۆتەوە ڕەحممان پێ بکە بە دڵنیایی هەر تۆ بەخشەری هەموو شتێکی..؟!

قال تعالى: ﴿رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ [المُمۡتَحَنَة : ٥] واتە : [ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا ] ئەی پەروەردگار مەمانکە بە فیتنە بۆ کافران، واتە: بەدەستی ئەوان سزامان مەدەو ئەوان زاڵ مەکە بەسەرماندا، یاخود لەلایەن خۆتەوە سزامان بۆ مەنێرە تا کافران نەڵێن ئەگەر ئەمانە لەسەر حەق بوونایە چۆن خوای گەورە ئاوا سزای ئەدان..؟!

## چوارەم : دوعا و پارانەوە بە (بأسلوب الاستفهام )

قال تعالى: ﴿أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ﴾ [الأَعۡرَاف : ١٥٥] واته: [ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا ] ئەی پەروەردگار ئایا ئێمە لەناو ئەدەی بەهۆی کردەوەی هەندێك لە کەسە خراپەکانی ئێمە لە (سامیری) و هاوەڵەکانی..؟!

قال تعالى: ﴿فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ مِّن سَبِيلٖ ١١﴾ [غَافِر : ١١] واته : [ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا ] وە ئێمە دان ئەنێین بە تاوانەکانی خۆماندا [ فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِنْ سَبِيلٍ (١١) ] ئایا هیچ ڕێگایەك هەیە بۆ ئەوەی کە لە سزای ئاگری دۆزەخ دەرچین و بگەڕێینەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی کردەوەی چاك بکەین..؟!

## پێنچەم : دعاو پارانەوە بە (بأسلوب الخبر )

قال تعالى: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧﴾ [الأَنبِيَاء : ٨٧] واته : [ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ ] دوای ئەوەی کە سواری کەشتییەك بوو ترسان لەوەی نقوم بێت، سێ جار تیرو پشکیان کرد یەکێکیان زیاد بوو فڕێی بدەنە ناو دەریاوە هەر سێ جارەکە یونس - صلى الله عليه وسلم - دەرچوو، بۆیە خۆی هەڵدایە ناو دەریاکەوەو نەهەنگێك قوتی دا ئەمیش لەناو تاریکی دەریاو تاریکی شەو و تاریکی سکی نەهەنگەکەدا لە خوای گەورە پاڕایەوە [ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ] ئەی پەروەردگار هیچ پەرستراوێك بەحەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی تۆ تاك و تەنهاو بێ شەریکی [ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ (٨٧) ] پاك و مونەززەهی بۆ تۆ بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم و ستەمم کرد کاتێك کە قەومەکەی خۆمم بەجێ هێشت لێم خۆشبە..؟!

قال تعالى: ﴿۞وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٨٣﴾ [الأَنبِيَاء : ٨٣] واته : {خوای گەورە شیفای ئەیوب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم – دەدات} [ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ ] وە ئەیوب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کاتێك لە خوای گەورە پاڕایەوە [ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ ] کە من تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوومە کە ئەوترێ: حەوت ساڵ یان هەژدە ساڵ نەخۆش بووە [ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (٨٣) ] وە هەر تۆ خوایە لە هەموو بەڕەحم و سۆزەکان بەڕەحم و سۆزو میهرەبانتری..؟!

## فەزول و گەورەیی دوعاو پارانەوە

**(خوای گەورە) لە قورئانە پیرۆزەکەی فەرمان بە بەندەکانی خۆی دەکات کە دوعاو پارانەوە بکەن تەنها لەمن، وە داوای هەموو شتێك لە من  بکەن ، هەروەك دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠﴾ [غَافِر : ٦٠] واتە : تەنها لە خوا بپاڕێنەوە [ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ] وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: تەنها لە من بپاڕێنەوە من وەڵامتان ئەدەمەوە [ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي ] ئەو كەسانەی كە خۆیان بە گەورە ئەزانن لە ئاستی پاڕانەوە لە من و لێم ناپاڕێنەوە [ سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (٦٠) ] بە دڵنیایی ئەوانە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە زەلیلی و ڕیسوایی و سەرشۆڕی، (چونكە هەركەسێك لە خوا نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی تورە دەبێت، وە باشترین عیبادەت پاڕانەوەیە لە خوای گەورە، وە چەندێك لە خوا بپاڕێیتەوە زیاتر لێی نزیك دەبیتەوەو خۆشەویست دەبیت)..؟!

لە (النعمان كوری بشیر ) – **خوا لیٚ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : کە (خوای گەورە ) دەفەرموویێت** : (( {إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي} ، يَعْنِي قَالَ: عن دُعائي {سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ} )) [٤].

لە (ابو هريرة ) – **رحمەتی خوا لیٚ بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی** : ((أفضلُ العبادةِ الدُّعاءُ قالَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي قالَ عن دُعائي)) . [٥] **واتە : چاکترین پەرستن دوعاو پارانەوەیە ، (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : من ولامی هەموو دوعاو پارانەوەکان دەدەمەوە ، وە ئەوانەی خۆی بەگەورەدەزانن لە پەرستنی من ، دوعا و پارانەوە بکەن ..؟!**

---

[٤] -للطائف من دقائق المعارف ص ٦٨.

[٥] - ابن عدي (الكامل في الضعفاء ) (٦/٦٣١).



له (النعمان كوری بشیر ) – **خوا لیّ رازی بێت – له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی** : ((الدعاءُ هو العِبادةُ [ثمَّ قرأ وَقالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ داخِرِينَ] )) .[6] **واته: دوعاو پارانەوە پە رستنه ، له پاشاندا ئەم ئایه ته ی خوێندەوە** : قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ [غَافِر : ٦٠] واته : تەنها له خوا بپاڕێنەوە [ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ] وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: تەنها لە من بپاڕێنەوە من وەڵامتان ئەدەمەوە [ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي ] ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گەورە ئەزانن لە ئاستی پاڕانەوە لە من و لێم ناپاڕێنەوە [ سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (٦٠) ] بە دڵنیایی ئەوانە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە زەلیلی و ڕیسوایی و سەرشۆڕی، (چونكە هەركەسێك لە خوا نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی تورە دەبێت، وە باشترین عیبادەت پاڕانەوەیە لە خوای گەورە، وە چەندێك لە خوا بپاڕێیتەوە زیاتر لێی نزیك دەبیتەوەو خۆشەویست دەبیت)..؟!

قال تعالى: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾ [الإِسْرَاء : ١١٠]واته : [ قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: بپاڕێنەوە لە الله یان لە ڕەحمان جیاوازیان نیەو هەردووكیان ناوی تایبەتی خوای گەورەن [ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى ] لە هەر كامێكیان بپاڕێنەوە ئەوە ناوە جوانەكانیان هەیە [ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ] پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - خۆی شاردبووەوە لە مەككە، كە پێشنوێژی بۆ هاوەڵانی بكردایە دەنگی بەرز دەكردەوە، كە هاوبەشبڕیاردەران گوێیان لێبوایە جوێنیان دەدا بە قورئان و ئەوەی دایبەزاندووەو ئەوەی هێناویەتی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - كاتێك كە نوێژ ئەكەی دەنگ بەرز مەكەوە با كافران نەیبیستن و جوێن بە قورئان نەدەن [ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا ] وە دەنگیش زۆر نزم مەكەوە كە هاوەڵەكانت نەیبیستن [ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا (١١٠) ] بەڵكو مامناوەند بە نە زۆر بەرزو نە زۆر نزم، یان ئەمە ئەگەر بەتەنها نوێژت كرد، بەڵام ئیمام لە نوێژە ئاشكراكاندا لە بەیانی و مەغریب و عیشا وە لە ڕۆژی جومعەدا لە ڕكاتی یەكەم و دووەمدا دەنگ بەرز ئەكاتەوە، ئیمامی ئەبو بەكر شەونوێژی دەكرد بە دەنگی نزم، پرسیاری لێكرا وتی: من لەگەڵ خوای گەورە گفتوگۆ دەكەم و خوایش دەیبیستێت، وە ئیمامی عومەر بەدەنگی بەرز شەونوێژی دەكرد پرسیاریان لێكرد وتی: شەیتان دەردەكەم و خەوتوان بەخەبەر دێنم، كە ئەم ئایەتە دابەزی بە ئەبو بەكر وترا كەمێك دەنگ بەرز بكەوە، بە عومەریش وترا كەمێك دەنگ نزم بكەوە..؟!





[6] سنن الترمذي برقم (٣٢٤٧).



قال تعالى: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَـٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾ [الأَعْرَاف : ١٨٠] واته : {تەوەسول كردن بە ناوە جوانەكانی خوای گەورە} [ وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا ] وە خوای گەورە ناوە جوانەكانی هەیە تۆ بەو ناوە جوانانەوە لە خوا بپاڕێرەوەو بڵێ: یا رحمن یارحیم یا كریم یا عزیز، وە تەوەسولی پێ بكەو بڵێ: خوایە بۆ خاتری ناوە جوانەكانت، (هەركەسێك نەوەدو نۆ لە ناوە جوانەكانی خوای گەورە لەبەر بكات و لێی تێبگات و لە خۆیدا جێبەجێی بكات ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، وە ژمارەی ناوەكانی خوای گەورە كەس نایزانێت تەنها خۆی نەبێت چونكە هەندێك ناوی هەیە لە هیچ كتابێكی ئاسمانی داینەبەزاندووەو بەهیچ پێغەمبەرێكیشی نەووتووەو لای خۆی هێشتوویەتیەوە) [ وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ ] وە واز بێنن لەو كەسانەی كە بێ باوەڕن بە ناوەكانی خوای گەورە وەك موشریكان كە ناوی بتەكانیان لەناوەكانی خوای گەورە وەرگرتبوو وەكو (لات و عوززازو مەنات)، یان ئەوانەی كە ئینكاری ناو و سیفاتەكانی خوای گەورە ئەكەن و بە درۆی دەزانن، ئیلحاد واتە: لادان لە مەبەست [ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٨٠) ] ئەمانە سزای ئەو كردەوەیان وەرئەگرن كە باوەڕیان بەناوەكانی خوای گەورە نیە..؟!

قال تعالى: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾ [الأَعْرَاف : ٥٥ - ٥٦]واته : [ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] ئێوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بە زەلیلی و ملكەچی وە بە نهێنی نەك بە دەنگی بەرزو هاوار كردن [ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٥٥) ] بەڕاستی خوای گەورە ئەو كەسانەی خۆش ناوێ كە سنوور ئەبەزێنن لە پاڕانەوەندا، وەكو داواكردنی كۆشكێكی سپی لەلای راستی بەهەشت، یان داوای شتێكی وا بكەن كە مافی ئەوان نەبێت، یاخود دەنگ زۆر بەرز بكەنەوەو هاوار بكەن لە كاتی پاڕانەوەدا..؟! [ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ] وە ئێوە ئاشووب لەسەر زەوی مەنێنەوە بە كوشتن و وێرانكاری لە دوای ئەوەی كە خوای گەورە ئیصلاح و چاكسازی لە زەوی كردووە بەهۆی ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی كتێبەكان [ وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ] وە ئێوە عیبادەتی خوای گەورە بكەن لە ترسی دۆزەخ و سزای خوای گەورە، وە بە تەماحی بەهەشت و پاداشتی خوای گەورە [ إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ (٥٦) ] بەڕاستی ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خوای گەورە نزیكە لە چاكەكاران..؟!





قال تعالى: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ [البَقَرَةِ : ١٨٦] واته : [ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ] ئەی محمد صلى الله عليه وسلم ئەگەر بەندەکانی من پرسیاری منیان لێت کرد ئەوە من لێیانەوە نزیکم بە زانست و زانیاری و بیستن و بینین و تواناو دەسەڵات و ویست و ئیرادە، بەڵام زاتی پیرۆزی خوای گەورە لەسەر عەرشە [ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ] هەر کەسێك لە من بپاڕێتەوە ئەوا وەڵامی ئەدەمەوە یان ئەوەتا بۆی جێبەجێ ئەکەم، یان بە ئەندازەی ئەوە بەڵاو موسیبەتی لەسەر لائەدەم، یان لە قیامەتدا پاداشتی ئەدەمەوە [ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦) ] بەڵام بەو مەرجەی ئەوانیش با لە من بپاڕێنەوە، یان وەڵامی بانگەوازی من بدەنەوە، وە با ئیمانم پێ بێنن بەڵکو خوای گەورە بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەتیان بدات..؟!







له (ابو هريرة ) –خوا لىٚ رازى بيٚت – له پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((ليسَ شيءٌ أكْرمَ على اللّهِ تعالى منَ الدُّعاءِ )) .[٧] واته : هيچ شتىٚ له لاى خوا له دوعا و پارانەوه بەريٚزتر نيه ..؟!

له (كورى مالك ) – –خوا لىٚ رازى بيٚت – له پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((الدُّعاءُ مخُّ العبادةِ)) .[٨]
واته: دوعاو پارانەوه مۆخ و كرۆكى پەرستنه ..؟!

له (ابو هريرة ) –خوا لىٚ رازى بيٚت – له پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((مَن لم يسألِ اللّهَ يغضبْ عليه)) .[٩] واته: بەراستى هەر كەسيٚك دوعاو پارانەوه نەكات يان له (خواى گەوره ) نەپاريٚتەوه ئەوا (خواى گەوره) ليٚى تووره دەبيٚت..؟!

له (ثوبان موالي رسول الله ﷺ )- خوا لىٚ رازى بيٚت – له پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : ((لايُرَدُّ القدرَ إلَّا بالدُّعاءِ ولا يزيدُ في العمُرِ إلَّا البرُّ وإنَّ الرَّجلَ ليُحرَمُ الرِّزقَ بالذَّنبِ يصيبُه )) .[١٠] واته : قەزاو قەدر گۆرانى بەسەر نايەت تەنها به دوعا پارانەوه نەبيٚت ، تەمەنيش دريٚژ نابيٚت تەنها به چاكه كردن نەبيٚت ، وه بەندەش رزق رۆزى حەرام دەكات به گوناهو تاوانى زۆر..؟!

له (ابو هريرة ) –خوا لىٚ رازى بيٚت – له پيٚغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (خواى گەوره ) دەفەر موويٚت ((أنا عندَ ظنِّ عبدي بي، وأنا معه إذا دَعاني)).[١١] واته: بەندەى من گومانى چۆن بىٚ بەرامبەر به من ، منيش ئەو شيٚوەيه دەبم لەگەلى ، واته : ئەگەر گومانى باش بوو ئەوا منيش باش دەبم لەگەلى ، ئەگەر گومانى خراپ بوو ئەوه منيش خراپ دەبم لەگەلى ، وه من لەگەليدام كاتىٚ كه ليٚم دەپاريٚتەوه ..؟!



---

[٧]- سنن الترمذي برقم (٣٣٧٠).
[٨]- سنن الترمذي برقم (٣٣٧١).
[٩]- سنن الترمذي برقم (٣٣٧٣).
[١٠]- ابن حجر العسقلاني هداية الرواة (٤/٤١١).
[١١]-سننالترمذي برقم (٢٣٨٨).



**له (ابو هريرة ) –خوا لىٚ رازى بيّت – له پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى :** ((مَن سَرَّهُ أن يستجيبَ اللهُ له عندَ الشدائدِ؛ فلْيُكْثِرِ الدعاءَ في الرَّخاءِ )) .[١٢] **واته : هەر كەسيّك پيّى خۆشه له كاتى نەهامەتى و كارەسات و تەنگانەدا (خواى گەوره) دوعاو پارانەوەى لىٚ قبول بكات با له كاتى خۆشى و تەندروست و خۆشگوزەرانى دا بپاريّتەوه ..؟!**

**له (جابري كوري عبدالله ) –خوا لىٚ رازى بيّت – له پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى :** ((أفضلُ الذِّكرِ لا إلهَ إلَّا اللهُ وأفضَلُ الدُّعاءِ الحمدُ للهِ )) .[١٣] **واته: گەورەترين و چاكترين زيكر و يادى (خواى گەوره ) بريتيه له ( لا إله إلا الله ) هەروەها گەورەترين و چاكترين دعاو پارانەوەش بريتيه له (الحمد الله ) ..؟!**

**له (ئه نس كورى مالك ) –خوا لىٚ رازى بيّت – له پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى : (خواى گەوره) دەفەرمويّت :** ((قال اللهُ تعالَى : يا ابنَ آدمَ, إنك ما دعَوتَني ورجَوتَني غفرتُ لك على ما كان منك ولا أُبالي , يا ابنَ آدمَ لو بلغَتْ ذنوبُك عَنانَ السماءِ , ثم استغْفَرْتني, غفرتُ لك, يا ابنَ آدمَ إنك لو أتيتَني بقُرابِ الأرضِ خطايا, ثم لَقِيتَني لا تشركُ بي شيئًا, لأتيتُك بقُرابها مغفرةً)) .[١٤] **واته : ئەى نەوەى ئادەم هەتا تۆ هاوارم بۆ بيّنى و ئوميّدت به من ببىٚ منيش ليّت خۆش دەبم ئيتر كارو كردەوەت هەر چيەك بىٚ دەربەست نيم ، ئەى نەوەى ئادەم ئەگەر گوناهو تاوانه كانت بگەنه كەنارى ئاسمان له پاشدا داواى لىٚ خۆشبوونم لىٚ بكەى ليّت خۆش دەبم ئيتر كارو كردەوەت هەر چيەك بىٚ دەربەست نيم ، ئەى نەوەى ئادەم كاتىٚ ديّى بۆ بارەگاى من نزيكەى پر به زەوى گوناهو تاوان لەگەل خۆت بهيّنى به مەرجىٚ به هيچ شيّوەيه ك هاوبەشت بۆ بريار نەدابم ، منيش لەسەر جەم گوناهو تاوانەكانت خۆش دەبم ..؟**

**له (سلماني الفارسي ) –خوا لىٚ رازى بيّت – له پيّغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى :** ((إنَّ اللهَ حَيِيٌّ كريمٌ يستحيي إذا رفع الرجلُ إليه يدَيه أن يردَّهما صِفرًا خائبتَينِ )) .[١٥] **واته : پەروەردگارى بەرزو شكۆمەندتان زۆر به حەياو بەريّزه و نازو نيعمەت بەخشه به بەندەكانى ، حەيا دەكا ئەگەر بەندەيەكى ئيماندارى دەستەكانى بۆ بەرزبكاتەوه به به تالى بيان گەريّنيتەوه..؟!**



[١٢] - سنن الترمذي برقم (٣٣٨٢).
[١٣] - سنن الترمذي برقم (٣٣٨٣).
[١٤] - سنن الترمذي برقم ( ٣٥٤٠).
[١٥] - سنن الترمذي برقم (٣٥٥٦).



**لە (عبدالله کوری مسعود) –خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((من نزلتْ به فاقةٌ فأنزلها بالنَّاسِ لم تُسدَّ فاقتُه ومن نزلت به فاقةٌ فأنزلها باللهِ فيوشكُ اللهُ له برزقٍ عاجلٍ أو آجلٍ )) .[16] **واتە: هەر کەسێ تووشی فەقیرو هەژاری و نەداری هات هانا بۆ خەلك بەرێت و پشتیان پێ ببەستێت ئەوا فەقیرو هەژاری نەدارییەکەی لە کۆل نابێتەوە و پێویستییەکانی بۆ دەستەبەر نابێت و بەردەوام هەژار دەبێت ..!! بەلام ئەو کەسەی هانا بۆ لای (خوای گەورە) بەرێت و تەنها پشت بەو ببە ستێت ئەوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوە : یان بە مردنی لە ناکاو رزگاری دەکات ، دەلێن : کەسێ لەنزیك دەولەمەندەکانی دەمرێ و لە میراتەکەی بەر دەکەوێت ، یان بە پەلە دەولەمەندی دەکات ..؟!**

**لە (عبدالله کوری مسعود) –خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((سلو اللهَ مِن فضلِهِ، فإنَّ اللهَ يُحبُّ أن يُسألَ، وأفضلُ العبادةِ انتظارُ الفرجِ )) .[17] **واتە: داوای بەهرەو بەخشش لە (خوای گەورە) بکەن ، چونکە پێی خۆشە لێی بپارێنەوە و داوای لێ بکەن ، چاکترین پەرستنیش چاوەروانی دەروو لێ کردنەوەیە لە دوای بەلاو ناخۆشی ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٣٢﴾ [النِّسَاء : ٣٢] واتە : [ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ ] لە جیاتی ئەوەی حەسوودی بەیەکتری ببەن داوای فەزڵ و چاکەی خوای گەورە بکەن [ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا (٣٢) ] بە دڵنیایی خوای گەورە زۆر زانایەو زانیاری بەهەموو شتێك هەیە..؟!

قال تعالى: ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١٤﴾ [غَافِر : ١٤] واتە : {تەنها لە خوای گەورە بپاڕێنەوە}

[ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەوپەڕی ئیخلاص و دڵسۆزی و نیازپاکییەوە، وە تەنها لە خوای گەورە بپاڕێنەوە [ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ (١٤) ] با کافرانیش پێیان ناخۆش بێ گوێیان پێ مەدەن..؟!



[16] - سنن الترمذي برقم (٢٣٢٦).
[17] -سنن الترمذي برقم (٣٥٧١).



قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾﴾ [غَافِر : ٦٥] واته : [ هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ] خوای گەورە هەمیشە زیندووەو تاك و تەنهایەو هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی (الله) نەبێ [ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] ئێوە بە تاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بكەن بەوپەڕی ئیخلاص و دڵسۆزیەوە دوور لە ڕیاو ڕووبینی [ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٦٥) ] حەمدو سەناو ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان لەسەر ئەو هەموو بەخششە زۆرانەی..؟!

**لە ( ابی سعید الخدری ) – خوا لێ ڕازی بێت –دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((ما من مُسلمٍ يدعو اللَّهَ بدعوةٍ ليس فيها إثمٌ ولا قطيعةُ رحِمٍ إلا أعطاه اللهُ بها إحدى ثلاثِ خِصالٍ إما أن يُعجِّلَ له دعوتَه وإما أن يَدَّخرَ له في الآخرةِ وإما أن يصرفَ عنه من السُّوءِ مثلَها)) .[18]

**واتە: هیچ موسامنێك نیە كە بپاڕێتەوە لە (خوای گەورە ) بە داواكاری یەك كە تاوان و پچراندنی ڕەحم نەبێت ئیلا (خوای گەورە ) یەكێك لەم سێ شتەی دەداتێ :**

**١–یان پارانەوەكەی بۆ پێش دەخات و گیرا دەبێت .**

**٢–یان بۆی هەڵدەگرێ بۆ پاداشتی قیامەت .**

**٣–یان بە ئەندازەی پارانەوەكەی خراپەو بەلای لێ دوور دەخاتەوە .**

**ووتیان: كەواتە  زۆر دەپاڕێینەوە ، ئەویش فەرمووی : (خوای گەورە ) زۆر پاداشتنان پێ دەبەخشێ .**



[18] –صحيح الجامع(٥/١١٦).



له (ابن القيم ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : دوعاو پارانەوە لە بەهێزترین هۆکارەکانی لاچوونی نارەحەتییە ، وە بە دەست هاتنی داواکاریەکانە ،وە بە سوودترین دەرمان و چارەسەرە ن چونکە دووژمنی بەلایە، پالی پێوە دەنێ و ڕێی لێ دەگرێت نا یەلێت دابەزێت و دەیگەرێنێتەوە ، یان ئەگەر دابەزی کەمی دەکاتەوە ، وە چەکی ئیماندارە ، وە دوعاو پارانەوە لەگەل بەلاو نسیبەتدا سێ پلەی هەیە :

١–ئەگەر پارانەوەکە بە هێزتر بوو لە بەلاکە بەرنگاری دەبێت و نایهیلێت .

٢–ئەگەر لاوازتر بوو لە بەلاکە ئەوا بەلاکە زال دەبێت بەسەریدا و تووشی بەندەکە دەبێت بەلام کەمی دەکاتەوە ئەگەر چی لاوازیش بێت .

٣یان بەرنگاریی یەك دەبن و هەریەکەیان ڕێ لەوی تر دەگرێت .[١٩]

له (سلمان فارسی ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لايَرُدُّ القضاءَ إلَّا الدُّعاءُ ولا يَزيدُ في العمرِ إلَّا البِرُّ )) .[٢٠] واتە: هیچ شتێك قەزاو قەدری (خوای گەورە) ناگەرێنێتەوە جگە لە دوعاو پارانەوە ،وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناکات جگە لە چاکە ..؟!



١٩-الجواب الكافي للامام ابن القيم ص ٢٢-٢٤

٢٠- السنن الترمذي برقم (٢١٣٩).

# مەرجەکانی دوعاو پارانەوە :

## مەرجی یەکەم : (الإخلاص ) واتە: نیازپاکی :

**ئەویش بریتیە لە پاکردنەوەی دوعاو پارانەوەو کردەوەکەت لە هەر شتێك کە بیشێوێنێت وناشرینی بکات ، وە ئەنجامدانی تەنها لەبەر خاتری (خوای گەورە) بێت بەبێ هاوەل دانان وە بەبێ ریياو بەر چاوێنی ، وە بەبێ بە تەمابوونی کالایەکی براوەو بەبێ تەصنوع کردن ، بەلکو بەندە دەبێت بە ئومێد پاداشتی خواو ترسان لە سزای و بە تەماعی رەزامەندی ئەو بێت**

**هەر وەك (خوای گەورە ) فەرمانی کردوە بە (الإخلاص ) کردن لە سەر بەندەکانی ، کە دەفەرموويێت :**

قال تعالى: ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩﴾ [الأَعْرَاف : ٢٩] واتە : {پەروەردگار فەرمانی کردووە بە دادپەروەری} [ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی کردووە بە دادپەروەری و دامەزراوی [ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ ] وە نوێژ بۆ خوای گەورە بکەن و ڕوو بکەنە قیبلە لە هەموو مزگەوتێکدا [ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] وە عیبادەتی خوای گەورە بکەن بە ئیخلاص و بەدڵسۆزیەوەو نیەتتان تەنها بۆ خوا بێ [ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ (٢٩) ] چۆن سەرەتا ئێوەی دروست کردووە ئاواش ئەتانگەڕێنێتەوە بەرووتی..؟!

قال تعالى: ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ١٤﴾ [غَافِر : ١٤] واتە : {تەنها لە خوای گەورە بپاڕێنەوە}

[ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] ئێوە بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەوپەڕی ئیخلاص و دڵسۆزی و نیازپاكییەوە، وە تەنها لە خوای گەورە بپاڕێنەوە [ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ (١٤) ] با کافرانیش پێیان ناخۆش بێ گوێیان پێ مەدەن..؟!

قال تعالى: ﴿هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٥﴾ [غَافِر : ٦٥] واتە : [ هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ ] خوای گەورە هەمیشە زیندووەو تاك و تەنهایەو هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی (الله) نەبێ [ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] ئێوە بە تاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بکەن بەوپەڕی ئیخلاص و دڵسۆزیەوە دوور لە ڕیاو ڕووبینی [ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٦٥) ] حەمدو سەناو ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان لەسەرێنەو هەموو بەخششە زۆرانەی..؟!



قال تعالى: ﴿مَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾ [البَيِّنَة : ٥] واته : {فەرمان كردن بە یەكخواپەرستی} [ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ] وە ئەهلی كتاب فەرمانیان پێ نەكرابوو تەنها بەوە نەبێ بەتاك و تەنها عیبادەتی خوای گەورە بكەن بە ئیخلاص و دڵسۆزی و نیاز پاكییەوە وە شەریكی بۆ دانەنێن [ حُنَفَاءَ ] وە لە شیرك لادەن و بێنە سەر تەوحید [ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ ] وە نوێژەكانیان ئەنجام بدەن لە كاتی خۆیدا بە ڕوكن و واجیبات و مەرجەكان و خشوعەوە [ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ] وە زەكاتی ماڵەكانیان بدەن و چاكە لەگەڵ فەقیرو هەژارو نەداراندا بكەن [ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ (٥) ] وە دینی ڕێك و ڕاست و دامەزراو و چاك ئەمەیە كە مرۆڤ بەتاك و تەنها خوا بپەرستێ و شەریك بۆ خوا دانەنێ وە نوێژەكانی ئەنجام بدات وە زەكاتی ماڵەكەی بدات..؟!

**لە (عبدالله كوری عباس )– ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : ئێمە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین ، فەرمووی :**

((يا غُلامُ إنِّي أعلِّمُكَ كلِماتٍ، احفَظِ اللَّهَ يحفَظكَ ، احفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تجاهَكَ ، إذا سأَلتَ فاسألِ اللَّهَ، وإذا استعَنتَ فاستَعِن باللَّهِ، واعلَم أنَّ الأمَّةَ لو اجتَمعت علَى أن ينفَعوكَ بشَيءٍ لم يَنفعوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ لَكَ، ولو اجتَمَعوا على أن يضرُّوكَ بشَيءٍ لم يَضرُّوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ عليكَ، رُفِعَتِ الأقلامُ وجفَّتِ الصُّحفُ )) .[٢١]

**واتە: ئەی لاو یان گەنج من چەند ووشەیەكت فێر دەكەم : سنووری (خوای گەورە ) بپارێزە (خوای گەورە ) دەتپارێزێت ، سنووری (خوای گەورە ) بپارێزە لە بەرەدەمت یان لە بەرەو رووتدا دەیبینیت دێت بە هاناتەوە ، ئەگەر پاراتیەوە تەنها لە (خوای گەورە ) دوا بكە ، وە ئەگەر پشتت بەست تەنها بە (خوای گەورە) ببەستە ، وە چاك بزانە ئەگەر هەموو خەڵكی كۆببنەوە تا سودێكت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ سودێكت پێ بگەیەنن جگە لەوەی كە (خوای گەورە) بۆی نووسیویت ، وە ئەگەر كۆببنەوە لە سەر ئەوەی زیانێكت پێ بگەیەنن هیچ زیانێكت لێ نادەن جگە لەوەی كە (خوای گەورە) لەسەری نووسیویت ، قەڵەم هەڵگیراوە و پەراویش ووشك بۆتەوە ..؟!**



[٢١] سنن الترمذي برقم (٢٥١٦)

## مەرجی دووەم : (المتابعه ) واتە: شوێن کەوتن :

**بێ گومان ئەم مەرجە دەبێتە سەرەکی ترین مەرج کە شوێن کەوتنی قورئان و سوننەت**

قال تعالى: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾ [الكَهۡف : ١١٠] واتە : [ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: من تەنها وەك ئێوە مرۆڤێكم فریشتە نیم یان خوا نیم [ يُوحَى إِلَيَّ ] جیاوازیەکەم ئەوەیە کە لەلایەن خوای گەورەوە وەحیم بۆ دێت و کراوم بە پێغەمبەر [ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ ] وە پەیامی منیش ئەوەیە کە پەرستراو و خوای ئێوە تەنها یەك خوایەکەو شەریکی نیەو تاك و تەنهایە [ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ ] جا هەر کەسێك بە ئومێدی گەیشتنە بە خوای گەورە لە رۆژی قیامەت بە سەری بەرزو بە رووی سپی کە باوەڕدارانن [ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا ] با لە دونیادا کردەوەی چاك بکەن، (واتە: لەسەر سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - بێت و بیدعە نەبێت) [ وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا (١١٠) ] وە لە کاتی عیبادەت کردن بۆ پەروەردگاری هیچ کەسێك نەکاتە شەریك بۆ خوای گەورە، (واتە: بۆ ریای نەبێت و بە ئیخلاص و دڵسۆزیەوە کردەوەکانی بۆ خوای گەورە ئەنجام بدات) ئەم ئایەتە هەردوو مەرجەکەی وەرگرتنی کردەوەی کۆکردۆتەوە، والله أعلم ..؟!

قال تعالى: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾ [النِّسَاء : ١٢٥] واتە: [ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ ] کێ دینی لەو کەسە باشترە کە رووی خۆی تەسلیمی خوای گەورە کردبێ، واتە: بە ئیخلاص و بەدڵسۆزیەوە کردەوە بۆ خوای گەورە ئەنجام بدات [ وَهُوَ مُحْسِنٌ ] وە چاکەکار بێ واتە: کردەوەکانی لەسەر سوننەت بێ، کە ئەمە هەردوو مەرجەکەی وەرگرتنی کردەوەیە لای خوای گەورە بەبێ ئەم دوو مەرجە خوای گەورە کردەوە لە هیچ کەس وەرناگرێت [ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ] وە شوێنی دینی ئیبراهیم کەوتبێ بە حەنیفی واتە: لە هەموو دینە پووچەڵ و شیرکەکان لایدابێ بۆ دینی حەقی ئیسلام [ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا (١٢٥) ] وە خوای گەورە ئیبراهیمی کردووە بە خەلیل و خۆشەویستی خۆی خَلِیل ئەوپەڕی خۆشەویستییە، وە پێغەمبەری خوایشی-صلى الله عليه وسلم - کردووە بە خۆشەویستی خۆی..؟!

قال تعالى: ﴿۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾﴾ [لُقۡمَان : ٢٢] واتە : {مەرجەکانی وەرگرتنی کردەوە لای خوای گەورە} [ وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ ] وە هەر کەسێك خۆی تەسلیمی خوای گەورە بکات و کارەکانی بە خوای گەورە بسپێرێ و ئیخلاص و دڵسۆزی و نیەتی بۆ خوا بێت [ وَهُوَ مُحْسِنٌ ] وە چاکەکاریش بێت، واتە: کردەوەکانی لەسەر سوننەت بێت و ملکەچی شەریعەت بێت [ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى ] ئەوە بە دڵنیایی دەستی گرتووە بە پەتی هەرە بەهێزەوە کە دینەکەی خوای گەورەیە کە پچڕانی بۆ نیە [ وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ (٢٢) ] وە سەرەنجامی هەموو کارەکانیش تەنها بۆ لای خوای گەورە ئەگەڕێتەوە..؟!

قال تعالى: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١﴾ [آلِ عِمۡرَان : ٣١]واته : {شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نیشانەی خۆشویستنی خوایە} [ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بفەرمە: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن خوای گەورەتان خۆش ئەوێ ئەوە شوێن من بكەون ئەوە ئەو كاتەش خوای گەورە ئێوەی خۆش ئەوێ وە لە تاوانەكانتان خۆش ئەبێ، كەسانێك بانگەشەی خۆشەویستی خوایان كرد خوای گەورە بەم ئایەتە تاقیكردنەوە، كەواتە هەركەسێك شوێن پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - نەكەوێت و بیدعە بكات ئەوە ڕاستگۆ نیە لە خۆشەویستی بۆ خوای گەورە، وە شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی خوای گەورەو هۆكارە بۆ دەستخستنی خۆشەویستی خوای گەورەو لێخۆشبوونی تاوانەكان [ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣١) ] وە خوای گەورە زۆر لێخۆشبوو و بەڕەحم و بەزەییە ..؟!

قال تعالى: ﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٥٤﴾ [النُّور : ٥٤] واته: [ قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - پێیان بڵێ: گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بكەن - صلى الله عليه وسلم -، واتە شوێن قورئان و سوننەت بكەون [ فَإِنْ تَوَلَّوْا ] وە ئەگەر پشتیان هەڵكرد [ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ ] ئەوە پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - تەنها گەیاندنی دینەكەی لەسەرە كە بە جوانترین و تەواوترین شێواز جێبەجێی كردووە [ وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ ] وە ئێوەش لێپرسینەوەتان لەگەڵدا ئەكرێ لەسەر ئەو ئەركەی لەسەر شانتانە كە گوێڕایەڵی كردن و ئیمان هێنانە [ وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ] وە ئەگەر بێتوو ئێوە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا بكەن - صلى الله عليه وسلم - ئەوە هیدایەت وەرئەگرن و دێنە سەر ڕێگای ڕاست [ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ (٥٤) ] وە هیچ شتێكیش لەسەر پێغەمبەری خوا نیە - صلى الله عليه وسلم - تەنها گەیاندنێكی ئاشكرا نەبێ كە دینەكەتان پێ بگەیەنێت..؟!

**لە (عائیشە دایكی ئیمانداران ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((مَن أَحْدَثَ في أَمْرِنَا هذا ما ليسَ فِيهِ، فَهو رَدٌّ )) [٢٢] واتە: هەر كەسێك تازەگەری یەك دابهێنێت كە لەم ئایینەی ئێمەدا نەبێت ئەوە ڕەد دەكرێتەوە و وەرناگیرێت ..؟!**

[٢٢] صحيح البخاري برقم (٢٦٩٧)

## مەرجی سێ یەم : (اليقين ) واتە: متمانەو باوەر :

**بەڵێ گەورەترین مەرجی قبول بوونی دوعاو پارانەوە (اليقين) متمانە بوونە بە (خوای گەورە) بەوەی بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایەو بە هەر شتێك بلێت ببە دەبێت ..؟!**

قال تعالى: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٤٠﴾ [النَّحل : ٤٠] واته : [ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ ] خوای گەورە ئەفەرمووێ: وتەی ئێمە بۆ هەر شتێك كە بمانەوێ جێبەجێی بكەین [ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٤٠) ] تەنها پێی ئەڵێین ببە یەكسەر ئەو شتە دروست ئەبێت..؟!

قال تعالى: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٨٢﴾ [يس : ٨٢] واته : [ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٨٢) ] كە خوای گەورە بیەوێ شتێك دروست بكات فەرمانی تەنها ئەوەندەیە كە ئەفەرمووێ: ببە یەكسەر ئەو شتە بە فەرمانی خوای گەورە دروست دەبێ..؟!

**لە (ابي ذر الغفاري ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – دەڵێت : لە پێغەمبەری خوا كە فەرموودەیەكی قودسیە كە لە (خوای گەورە ) وە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت :** (( ... يا عبادي لو أن أولكم وآخركم وإنسكم وجنكم قاموا في صعيد واحد فسألوني ، فأعطيت كل إنسان ماسألته ، ما نقص ذلك عندي إلا كما ينقص المخيط إذا أدخل البحر )). [٢٣] واتە: .... **ئەی بەندەكانم ئەگەر یەكەمین و دوایەمین و مرۆڤ و جنۆكەتان تێكرا لەیەك دەشتدا كۆببنەوە و داوام لێ بكەن و منیش وەلامی هەموویان بدەمەوە و چییان بۆێت بیاندەمێ هیچ لە مولكی من كەم ناكاتەوە و مەگەر بە ئەندازەی دەرزیەك كە هەلیكێشی لەدەریا یەك..؟!**

**بەلێ بەدلنیایەوە ئەمەش بەلگەیە لەسەر تەواوی توانای (خوای گەورە) تەواو مولكی ، وە ئەوە دەگەیەنێت كە مولك و خەزێنەكانی بە بە خشین تاواو نابێت یان نابرێتەوە و كەم ناكات ، ئەگەرچی بە یەكەمین و دوامینەكانی دروستكراوەكانی ببەخشێت لە جنۆكە و ئادەمیزاد كە هەر چی یەكی لێ داوا بكەن هەموو تێكرا لە یەك كاتدا ..؟!**

[٢٣] صحيح مسلم برقم (٢٥٧٧).



**له (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : له پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** (( يَدُ اللَّهِ مَلْأَى لا يَغِيضُها نَفَقَةٌ، سَحّاءُ اللَّيْلَ والنَّهارَ، وقالَ: أرَأَيْتُمْ ما أنْفَقَ مُنْذُ خَلَقَ السَّمَواتِ والأرْضَ، فإنَّه لَمْ يَغِضْ ما في يَدِهِ، وقالَ: عَرْشُهُ علَى الماءِ، وبِيَدِهِ الأُخْرَى المِيزانُ، يَخْفِضُ ويَرْفَعُ )) .[٢٤] **واته: دەستی (خوای گەورە ) پرە و بە خشینی زۆری لە شەو رۆژدا لیٚ کەم ناکات ،ئای نە تا بینیوە لەوەتەی (خوای گەورە) ئاسمان و زەوی بەدیهیٚناوە دەبەخشیٚت وە هیچ لەوەی کە لە دەستیایەتی کەمی نەکردووە ، لەکاتیٚکدا عەرشەکەی لە سەر ئاو بووەو بە دەستەکەی تری تەرازووی پیٚیە کە سانیٚك نزم دەکاتەوە و کەسانیٚك بەرز دەکاتەوە ..؟!**

**جاتیٚك کە بەندەی موسلمان ئەوەی زانی پیٚویستە لەسەر بە یەقین و متمانەوە بپاریٚتەوە لە (خوای گەورە) بەوەی کە وەلامی دەدریٚتەوە ، چونکە هیچ دوعاو پارانەوەیەك بیٚ وەلام نابیٚت ، جا ئەوی کە زووتر وەلامی دەبیٚت ، وەشی کە وەلامەکە دریٚژ خایەنە دەبیٚت ، یان ئەوەشی وەلامەکەی لەسەر پاداشتی بۆ دەبیٚت لە رۆژی دوایی دا ..؟!**

**له (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : له پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((ادعوا اللَّهَ وأنتم موقنونَ بالإجابةِ، واعلموا أنَّ اللَّهَ لا يستجيبُ دعاءً من قلبٍ لاهٍ )) .[٢٥] **واته: باش بزانن (خوای گەورە ) دوعاو پارانەوە کەسیٚ وەرناگریٚت لە کاتی پارانەوەکەدا دلّ ی فاغل و بیٚ ئاگابیٚ ..؟!**

**هەر لەبەر ئەمە پیٚغەمبەری خوا ﷺ روونی کردۆتەوە کە (خوای گەورە) وەلامی دوعاو پارانەوەی ئەو مسلمان دەداتەوە کە مەرجەکانی جیٚ بەجیٚ کردووە کاری بە ئادابەکانی دوعاو پارانەوە کردووە ، وە دوور کەوتووەتەوە لە بەر بەستەکانی گیرانە بوونی دوعاو پارانەوەکان ..؟!**



٢٤ - صحيح البخاري برقم ( ٤٦٨٤ ).
٢٥ -السنن الترمذي برقم ( ٣٤٧٩ ).

## مەرجی چوارەم : (الخشوع ) واتە: ئامادە بوونی دڵ لە ترسی (خوای گەورە)

**بەڵێ (خشوع) ئامادەبوونی دل به ئومید بوون بەو پاداشتەی کە لە لای (خوای گەورە) یە ، وە ترسان لە سزای (خوای گەورە ) هەر وەك دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ۝٨٩ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ۝٩٠﴾ [الأنبياء : ٨٩ - ٩٠]واتە : {زەکەریا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - داوای مندالا لە خوا دەکات} [ وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ ] وە زەکەریا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کاتێك لە پەروەردگاری پاڕایەوە [ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا ] ئەی پەروەردگار بەتەنها بەبێ منالْ جێم مەهێلەو منالْم پێ ببەخشە [ وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ (٨٩) ] وە تۆ باشترین خوای کە لە پاش مرۆڤ میراتگری بۆ جێدێلیت، میراتگر بۆ زانست و زانیاری و دین و پێغەمبەرایەتی..؟! [ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى ] ئێمەیش وەڵاممان دایەوە وە یەحیامان - صلى الله عليه وسلم - پێ بەخشی [ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ ] وە خێزانەکەیشیمان چاك كرد كە نەزۆك بوو وامان لێ كرد كە منداڵی ببێ [ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ ] بە دڵنیایی ئەم پێغەمبەرانە دەستپێشخەریان ئەکرد لە کردەوەی چاکدا [ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ] وە لێمان دەپاڕانەوەو عیبادەتی ئێمەیان ئەکردو ڕەغبەتیان هەبوو لە خێرو چاکە، وە لە شەڕو خراپە خۆیان پاراستووە، یاخود بە ڕەغبەتی بەهەشتەوەو لە ترسی دۆزەخدا عیبادەتی ئێمەیان کردووە [ وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ (٩٠) ] وە بۆ ئێمە ملکەچ و باوەڕدار بوونە..؟!

قال تعالى: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ۝٢٠٥﴾ [الأعراف : ٢٠٥]واتە : [ وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ ] وە زیکری خوای گەورەش بکە لە دڵی خۆتدا بە ملکەچی و زەلیلی و نهێنی، واتە: بەدەنگی نزم [ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ] بە بەیانیان و دوای عەصر، واتە: زیکری بەیانیان و ئێواران بخوێنە لە دوای بانگی بەیانی تا خۆر کەوتن، وە دوای بانگی عەصر تا خۆرئاوا بوون، بەدەنگی نزم زیکری خوای گەورە بکە، (کەواتە نابێت بە دەنگی بەرز زیکری خوای گەورە بکرێت، بەڵکو دەبێت بە دەنگی نزم بێت، تەنها تەکبیرەکانی جەژن نەبێت، وە تەلبیە لە کاتی حەج و عومرە کە سوننەتە بە دەنگی بەرز بێت سەبارەت بە پیاوان) [ وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ (٢٠٥) ] وە تۆ لەو کەسانە مەبە کە بێئاگان لە زیکری خوای گەورە..؟!

**مەرجی پێنچەم : (عزم و جزم ) واتە: سووربوون کۆشش لە دوعاو پارنەوە:**

**بەڵێ لە سەر موسلمان پێویستە ئەگەر لە (خوای گەورە ) دوعاو پارانەوە بکات ، ئەوا دەبێت سووربێت کۆشش بکات بەردەوام بێت لە سەر دوعاو پارانەوەکەی ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە (الاستثناء ) کردن لە پارنەوە..؟!**

**لە ( ئەنس کوری مالك ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((إذا دَعا أحَدُكُمْ فَلْيَعْزِمْ في الدُّعاءِ، ولا يَقُلْ: اللَّهُمَّ إنْ شِئْتَ فأعْطِنِي، فإنَّ اللَّهَ لا مُسْتَكْرِهَ له )) .[26] **واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دوعای کرد یان پارایەوە با بە (عزم ) وە بپارێتەوە نە لێت : خوایە  ئەگەر ئەتەوێت پێم ببەخشە ، چونکە (خوای گەورە) ناچارکراو و زۆر لێکراو نیە ، بۆ وەلامدانەوە ..؟!**

**مەبەست لەم دوو ووشەیە (عزم ) و (جزم ) ئەوەیە کەسێك پێویستی بەوەیە کە داوات لیٚ کرد پێی بلێت : ئەگەر ویستت لێیەتی کە بگونجێت روو گیر ببێت و لە روودا بمێنێت و پێی ناخۆش بێت بە داواکەت ، بۆیە پێی بلێت : ئەگەر ویستت لێیەتی ، هاتا قورس و گرانی نەخرێتە سەری ، بەلام (خوای گەورە) بەهیچ شێوەیەك لەم نەقسانەیان کەم وکوریانە نیە..؟!**

**لە (ابو هریرە ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((لا يَقولَنَّ أحدُكم: اللَّهمَّ اغفِرْ لي إنْ شِئتَ، اللَّهمَّ ارحَمْني إنْ شِئتَ، ولكنْ ليَعزِمِ المَسألةَ؛ فإنَّه لا مُكرِهَ له)) .[27] **واتە : باکەسیٚ لە ئێوە نەلێت : خودایە  ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی لێم خۆشبە ، خودایە ئەگەر خۆت ویستت رەحمم پیٚ بکە ، بە (عزم)وە بپارێنەوە ، چونکە کەس زۆری لە سەر (خوای گەورە ) نیە ..؟!**

[26] -صحيح البخاري برقم (٦٣٣٨).
[27] -السنن الترمذي برقم (٣٤٩٧).

## چەند مەرجی کی تری گیرا بوونی دوعاو پارانەوە :

١-أن يبدأ بحمد الله والثناء عليه ثم بالصلاة على النبى ﷺ ويختم بذلك .

واتە: سوپاسو ستایش کردنی (خوای گەورە )و ئینجا صلاوتدان لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەست پێ بکات و هەر بە صلاواتدان کۆتایی پێ بهێنێت .

٢-الجزم فى الدعاء واليقين بالإجابة .

واتە: سور بوون لە داوا کردن و دلنیابوون متمانە بوون بە وەلامانەوە .

٣-الإلحاح في الدعاء وعدم الاستعجال .

واتە: داکۆکی کردن لە دوعاو پارانەوە و داواکردن و پەلە نەکرد لە وەلامدا نەدانەوە .

٤-حضور القلب في الدعاء .

واتە: ئامادە بوونی دڵ و بیروهۆش لە کاتی دوعاو پارانەوە دا .

٥-الدعاء في الرخاء والشدة .

واتە :دوعاو پارانەوە لەکاتی خۆشی و شادی ، وە لە کاتی تەنگانەو نارەحەتی دا .

٦- لايسأل إلا الله وحده .

واتە: داوا لە کەس نەکات جگە لە (الله )تعالی نەبێت ، بە تەنها دوعا و پارانەوەمان داواکرد بەس (خوای گەورە) یە .

٧-عدم الدعاء على الأهل ، و المال ، والولد ، والنفس .

واتە: دوعا و پارانەوە نەکات لە کەس و کارو مال و مندال و خودی خۆی .

٨-خفض الصوت بالدعاء بين المخافتة والجهر .

واتە: دەنگ نزمکردنەوە بە دوعاو پارانەوە لە نێوان شاردنەوە و ئاشکراکردندا ، واتە: ئەوەندە دەنگی هەبێ کە خۆی گوێی لێ بێت .

٩-الاعتراف بالذنب والاستغفار منه ، والاعتراف بالنعمة و شكر الله عليها .

**واته: دان پیٚ دانان به تاوان و گوناه و داوای لیٚ خۆشبوون لیٚی ، وه دان پیٚ دانان به ناز و نیعمەتەکانی (خوای گەورە) و شکرو سوپاس کردن لەسەری .**

١٠-التضرع والخشوع والرغبة والرهبة .

**واته: ملکەچی دەربرین و ترس و خۆشکاندنەوە و ئارەزوو کردنی خێر و یان ترسان له خراپه هاتنه ریٚ .**

١١-رد المظالم مع التوبة .

**واته: گێرانەوەی شته ستەم لێکراوەکان یان ئەو ستەمەی کردووته له خەلك برۆ حەقی بدەرەوە ئینجا توبەی بکه .**

١٢-الدعاء ثلاثا .

**واته: وا باشتر دوعاو پارانەوە سیٚ جار بێت .**

١٣- رفع الأيدي في الدعاء .

واته: بەرز کردنەوە دەستەکان له کاتی دوعاو پارانەوە دا .

١٤-الضوء قبل الدعاء إن تيسر .

**واته: وا باشه دەست نوێژت هەبیٚ له کاتی دوعاو پارانەوە دا .**

١٥-أن لا يعتدي في الدعاء .

**واته: وا باشه زیادە رۆیی نەکات له کاتی دوعا پارانەوە دا .**

١٦-أن يبدا الداعي بنفسه إذا دعا لغيره .



واتە: وا باشە دوعا کردن لە خۆیەوە دەست پیّ بکات ، پاشان لە کەس و کاری دۆستەکانی خۆی لەگەڵ موسلمانان.

١٧-أن يتوسل إلى الله بأسمائه الحسنى و صفاته العلى .

**واتە: تکا کردن لە (خوای گەورە ) بە خاتری ناو چاك و جوانە کان وە سیفەتە بەرزەکان .**

١٨-أن يكون المطعم والمشرب والملبس من حلال .

**واتە: دەبێت خواردن و خواردنەوە وە پۆشاك و جل بەرگە کانی حەلال بێت ، دوور بکەوێتەوە هەر چی حەرامە .**

١٩-لايدعو بإثم او قطعية رحم .

واتە: لە دوعاو پارانەوەدا تاوانی گوناهی پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی تێدا نەبێت.

٢٠-الابتعاد عن جميع المعاصي .

**واتە: دوور کەوتنەوە لە هەموو تاوان و گوناهەکان کە (خوای گەورە) و پێغەمبەرەکەی ﷺ حەرامیان کردووە .**



## موانع إجابة الدعاء :

## ڕێگریەکانی وەلام نەدانەوەی دوعاو پارانە :

### یەکەم : ڕۆچوون لە حەرامدا :

**وە ك : ستەم کردن و خواردن و خواردنەوەی حەرام و لە بەر کردنی جل بەرگی حەرام ، یان بەرتیل و ریشوە وەرگرتن یان بە تالان بردنی مالی خەلك دەولەت ..؟!**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلیٚت : پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((يا أيُّها النَّاسُ إنَّ اللَّهَ طيِّبٌ لا يقبلُ إلَّا طيِّبًا، وإنَّ اللَّهَ أمرَ المؤمنينَ بما أمرَ بِه المرسلينَ فقالَ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ وقالَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ قالَ وذَكرَ الرَّجلَ يُطيلُ السَّفرَ أشعثَ أغبرَ يمدُّ يدَه إلى السَّماءِ يا ربِّ يا ربِّ ومطعمُه حرامٌ ومشربُه حرامٌ وملبسُه حرامٌ وغذِّيَ بالحرامِ فأنَّى يستجابُ لذلِك)). [28] **واتە: ئەی خەلکینە (خوای گەورە) بۆ خۆی پاك و خاوێنە هەر چی پاك خاوێن و حەلال نەبیٚ قبولی ناکات ، بیٚ گومان (خوای گەورە) هەر فەرمانیٚکی بە پیٚغەمبەران کردبیٚ ، هەمان فەرمانیشی بە باوەرداران کردووە ،** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ۝٥١﴾ [المُؤۡمِنُون : ٥١] ، **واتە: ئەی پیٚغەمبەر بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك ، کارو کردەوەی باش بکەن ، بەراستی من بەوەی ئیٚوە دەیکەن ئاگادارم ، هەروەها دەفەرموویٚت :** قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٢] ، **واتە: ئەی ئەوانە باوەرتان هیٚناوە ، بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك کە ئیٚمە کردومانن بە رزق و رۆزی ئیٚوە ، ئینجا پیٚغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاویٚکی کرد دەچیٚ بۆ سەفەری دوور و دریٚژ قژی گف دەبیٚ تیٚك دە ئالیٚ ،وە چلك تەپ و تۆزی لیٚ دەنیشیٚ دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەپاریٚتەوە دەلیٚت : ئەی پەروەردگارم ، خواردن و خواردنەوەی حەرامە ، پۆشاکی حەرامە ، بەحەرام گۆشکراوە ، دەی ئیتر پارنەوەی چۆن لیٚ وەردەگیریٚ یان ئیتر چۆن وەلامی پارانەوەکەی دەدریٚتەوە ..؟!**

**مەبەست لەم فەرموودەیە کە (ابن رجب ) – رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت – هیٚناویەتەوە ووتراوە : (خوای گەورە) هیچ کردەوەیەك وەرناگریٚت تەنها ئەوانە نەبیٚت کە پاك لە هەموو تیٚکدەرەکان وەك رییا و عوجب ، وە هیچ سامانیٚکیش وەرناگریٚت تەنها ئەوانە نەبیٚت کە پاکەو حەلالە چونکە وەسفی پاکیٚتی دەدریٚتە پال کردارەکان و گوفتارەکاو بیروباوەرکانیش .** [29]

---

[28] - السنن الترمذي برقم ( ٢٩٨٩ ).
[29] -جامع العلوم والحكم (١/٢٥٩ ).

**دووەم : پەلە کردن لە دوعا یان وازهێنان لە دوعا پارانەوە :**

**بەلێ یەکێکی تر لەو رێگرانە دبنە هۆی وەلام نەدانەوەی دوعاو پارانەوە ئەوەیە کە مرۆڤی موسلمان پە لە بکات و واز لە دوعاو پارانەوە بهێنێت ، بە هۆی ئەوەی وەلامدانەوەکەی تاخیر بووە یان درەنگ کەوتووە. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم رێگریە کردۆتە بەربەستێك لە بەر بەستەکانی وەلامدانەوە ، بۆ ئەوەی بەندەی موسلمان بێ ئومێد نەبێت لە وەلامی پارانەوەکەی ئەگەر ماوەیەکی درێژی پێ بچێت ، چونکە (خوای گەورە ) ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە زۆر (إلحاح) دەکەن یان سوورن و بەردەوامن لەسەر دوعا پارانەوەکانیان ..؟!**

**لە (ابو هريره) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((يُستَجابُ لأحدِكم ما لم يعجَلْ قيل وكيف يعجَلُ يا رسولَ اللهِ قال يقولُ قد دعوتُ اللهَ فلم يستجِبِ اللهُ لي)) .[30] **واتە: (خوای گەورە) وەلامی دوعاو پارانەوەی کە سێکتان دەداتەوە بەو مەرجەی پەلە پەل نەکات وەك : بلێ هەر دەپارێمەوە بەلام پارانەوەکەم گیرا نەبووە یان قبول نابێت ..؟!**

**لە (ابو هريره) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((لَا يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ، ما لَمْ يَدْعُ بإثْمٍ ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ ، ما لَمْ يَسْتَعْجِلْ قيلَ: يا رَسُولَ اللهِ، ما الاسْتِعْجَالُ؟ قالَ: يقولُ: قدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذلكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ)) .[31] **واتە: بەردەوام دوعاو پارانەوەی بەندە وەردەگێرێت یان قبول دەبێت ، مادەم دوعاو پارانەوەکەی خراپ و گوناه نیە ، یان پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی ، یان پەلە نەکردن لەوەلامی دوعا و پارانەوەکەی ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە کردن چیە ..؟!فەرمووی : دەلێ : دوعام کرد دوعام کرد و لێم وەر نەگیرا ، ئەو کاتە واز لە دوعاو پارانەوە دەهێنێت و داوا لە (خوای گەورە ) ناکات ..؟!**

قال تعالى: ﴿وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾

[الأَعۡرَاف : ٥٦]واتە : [ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ] وە ئێوە ئاشووب لەسەر زەوی مەنێنەوە بە کوشتن و وێرانکاری لە دوای ئەوەی کە خوای گەورە ئیصڵاح و چاکسازی لە زەوی کردووە بەهۆی ناردنی پێغەمبەران و دابەزینی کتێبەکان [ وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ] وە ئێوە عیبادەتی خوای گەورە بکەن لە ترسی دۆزەخ و سزای خوای گەورە، وە بە تەماحی بەهەشت و پاداشتی خوای گەورە [ إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ (٥٦) ] بەڕاستی ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خوای گەورە نزیكە لە چاکەکاران..؟!

[30] -السنن ابي داود برقم (١٤٨٤).

[31] -صحيح مسلم برقم (٢٧٣٥).

## سێ یەم: ئەنجامدانی تاوان و سەرپێچییە حەرامکراوەکان :

**بەڵێ زۆر جار ئەنجامدانی کردەوە حەرامکراوەکان دەبێتە هۆی رێگری لە وەلامدانەوەی دەعا .**

**هەر لەبەر ئەم هۆکارە هەندێك لە زانایان ووتویانە : وەلامدانەوەی دعاو پارانەوەکەت بە خاو مەزانە کاتێك تۆ رێگەکەییت بە تاوان گرتووە ..؟! وە گومانی تێدانیە بێ ئاگایی غافل بوون و کەوتنە ناو ئارەزووەکانی دونیا و یان حەرامکراوەکانی دونیا ، ئەمانە هۆکارێکە لە بێ بەش بوون لە هەمو خێرو چاکەکان ، هەر وەك (خوای گەورە ) دەفەرموویت** : قال تعالى: ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ١١﴾ [الرَّعْد : ١١] واتە: {خوای گەورە هیچ قەومێك ناگۆڕێت تا خۆیان نەگۆڕن} وە هەر کەسێك لە تاریکی شەودا بە شاراوەیی تاوان ئەنجام بدات یاخود بە ئاشکرا لە ڕۆژدا خوای گەورە ئاگای لە هەمووی هەیە [ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ] وە خوای گەورە فریشتە پارێزەرەکانی هەیە کە لە پێش و دواوەی مرۆڤەوە بە فەرمانی خوای گەورە مرۆڤەکان ئەپارێزن لە ڕووداوەکان [ إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ ] بە دڵنیایی خوای گەورە هیچ قەومێك ناگۆڕێت یان لە هەر نازو نیعمەتێکدا بن لێیان ناگۆڕێ تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن بە خراپەکاری [ وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ سُوءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُ ] وە ئەگەر خوای گەورە بیەوێ کەسانێك تووشی سزاو لەناو چوون بکات ئەوە کەس ناتوانێ سزای خوای گەورە بگەڕێنێتەوە [ وَمَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ (١١) ] وە هیچ کەسێکیش نیە کە سەرپەرشتی کاروباریان بکات لە غەیری خوای گەورە یان پەنای بۆ بەرن یان سزاکەیان لەسەر لادات..؟!

**چوارەم : وازهێنان لە فەرزو واجباتانەی (خوای گەورە) واجبی کردووە:**

**بەڵێ هەر وەك چۆن ئەنجاندانی کارو کردەوە چاکەکان هۆکارێکە بۆ گیرا بوون یان قبول بوونی دوعا پارانەوە ، بە هەمان شێوە ترك کردن یان واز هێنان لە فەرز و واجباتەکان دەبێتە رێگری کردن لە رێگرەکانی وەلامدانەوە دوعا پارانەوە ..؟!**

لە (حذيفة بن اليمان ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((والَّذي نَفسي بيدِهِ لتأمُرُنَّ بالمعروفِ ولتَنهوُنَّ عنِ المنكرِ أو ليوشِكَنَّ اللَّهُ أن يبعثَ عليكُم عقابًا منهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلَا يُسْتَجَابُ لَكُمْ)).[32] واتە : سوێند بە (الله) کە گیانی من بەدەستە یان ئەوەتا فەرمان دەکەن بە چاکە و رێگری دەکەن لە خراپە ، وە یان زۆر نزیکە (خوای گەورە ) سزاو تۆلەیەکی سەختتان بۆ بنێرێ ، لە پاشدا بپارێنەوە وەلامتان نادرێتەوە ، واتە: دوعا و پارانەوە کانتان لێ وەرناگیرێت یان قبول ناکرێت ..؟!

**پێنچەم : حیکمەتێکی پەروەردگار بەوەی ئەوشتەی بۆی پاراوەتەوە چاکتری بداتێ :**

لە ( ابی سعيد الخدری ) – خوا لێ رازی بێت –دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((ما من مُسلمٍ يدعو اللَّهَ بدعوةٍ ليس فيها إثمٌ ولا قطيعةُ رحِمٍ إلا أعطاه اللَّهُ بها إحدى ثلاثِ خِصالٍ إما أن يُعجِّلَ له دعوتَه وإما أن يَدَّخرَ له في الآخرةِ وإما أن يصرفَ عنه من السُّوءِ مثلَها)) .[33]

**واتە: هیچ موسامنێك نیە کە بپارێتەوە لە (خوای گەورە ) بە داواکاری یەك کە تاوان و پچراندنی رەحم نەبێت ئیلا (خوای گەورە ) یەکێك لەم سێ شتەی دەداتێ :**

**١–یان پارانەوەکەی بۆ پێش دەخات و گیرا دەبێت .**

**٢–یان بۆی هەلدەگرێ بۆ پاداشتی قیامەت .**

**٣–یان بە ئەندازەی پارانەوەکەی خراپەو و بەلای لێ دوور دەخاتەوە .**

**ووتیان: کەواتە زۆر دەپارێینەوە ، ئەویش فەرمووی : (خوای گەورە ) زۆر پاداشتنان پێ دەبەخشێ .**

**بەڵێ لەوانەیە مرۆڤ وا گومان ببات کە دوعاو پارانەوەکەی وەلام نەدراوەتەوە ، لە کاتێکدا لەوەی کە داوای کردووە زیاتری پێ بەخشراوە هەر ئاگاشی لێ نیە، یان لە زۆر بەلاو نسیبەت و نەخۆشی پاراستووەتی ، یان پاداشتی دوعا و پارانەوەکەی دواخراوە بۆ رۆژی دوایی ..؟!**

---

[32]- السنن الترمذي برقم (٢١٦٩).

[33]-صحيح الجامع(١١٦/٥).

## هەندێك لەو سنوور بەزاندنانەی  لەكاتی دوعا پارانەوەدا :

**بەڵێ لەكاتی دوعا كردندا دورست نیە هەندێك لەو دوعاو پارانەوە یانە ئەنجام بدرێت ، چەنكە دوورە لە رووی شەرعەوە .**

**لە (ابن القیم ) – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت : (هەر دوعاو پارانەوەیەك پێچەوانەی حیكمەتی (خوای گەورە) بێت یان نەگونجێت لەگەل شەرع و فەرمانی (خوای گەورە ) دا ، یاخود پێچەوانەی ئەوە بێت كە خۆی هەواڵی پێ داوە ئەو ئەوا بە دلنیایەوە سنوور بەزاندنە و خۆی و داواكارەكەشی خۆش ناوێت ) .** [٣٤]

قال تعالى: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٥٥﴾ [الأَعۡرَاف : ٥٥] واته : [ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] ئێوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بە زەلیلی و ملكەچی وە بە نهێنی نەك بە دەنگی بەرزو هاوار كردن [ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٥٥) ] بەڕاستی خوای گەورە ئەو كەسانەی خۆش ناوێ كە سنوور ئەبەزێنن لە پاڕانەوەندا، وەكو داواكردنی كۆشكێكی سپی لەلای ڕاستی بەهەشت، یان داوای شتێكی وا بكەن كە مافی ئەوان نەبێت، یاخود دەنگ زۆر بەرز بكەنەوەو هاوار بكەن لە كاتی پاڕانەوەدا..؟!

**بێ گومان (خوای گەورە ) سنوور شكێنەكانی خۆش ناوێت ، لە هەر كارو كردەوەیەك كە بەندە ئەنجامی بدات ، چونكە هەر سنوور شكادنێك دەرچوونە لە پەیامی (خوای گەورە) و پێغەمبەرەكەی یان سنوور شكاندنە لە شەرعدا ، وە گەورە ترین سنوور بەزاندن یان شكاندن ئەو كەسەی كە شرك هاوەل بڕیاردەدا بۆ (خوای گەورە ) جا لێرەدا مەبەستمان ئەوەی لە كاتی دوعاو پارانەوە نابێت سنوور بشكێنین یان بە بەزێنین ، وەك ئەوەی دوعاو پارانەوە بكەین لە مردوو یان لە پیاو چاكان جگە لە (خوای گەورە ) ئەمانە هەر هەمووی شرك هابەشی دانانە بۆ (خوای گەورە ) ، هەر بۆیە لە سەر موسلمانان قەدەغەكراوە ، توسل بە مردووەكان ببەین یان هانا و هاوار لە مردووەكان بكەین ، هەروەها هاناو هاوارو دوعاكان و پارانەوەكانمان روو لە بەناو پیاو چاكان بكەین یان ئێستا لەم سەردەمەدا هاوار هانا بۆ خەوسی گەیلانی دەبەن یان بەناو تەریقەتی شێخ و مشایەخەكان ئەمانە هەر هەمووی شرك هابەشی دانانە بۆ خوای پەروەردگار ، بۆیە دەبێت موسلمان بزانێ فێر بێت چۆن دوعاو پارانەوە دەكات ، وە ئادابەكانی دوعاو پارانەوە فێر بێت ، بۆ ئەوەی تووشی شرك هابەشی بریار دانان نەبێت ، یان بزانێ لە چ كات سات و شوێنێك زۆر دوعا پارانەوە ئەنجام دەدات ، هەروەها بزانێ دوعاكان لە چ كاتێك دا گیرا دەبێت ، وە چۆنیەتی دوعاو پارانەوە بە شێوەیەك بێت سنوور نەبەزێنی ،یان دەرنەچێت لە قورئان و سوونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ .**

[٣٤] بدائع الفوائد (٣/١٣).

## هەندێك لەو نموونانەی سنوور بەزاندن لە دوعاو پارانەوە :

**١-داوا كردن و پارانەوە لە غیری پەروەردگار ، وەك ئەوەی داوا لە مرۆڤ و جنۆكە بكەیت یان شتی تر بكرێت .**

**٢-توسل كردن بە شتێك كە بیدعە بێت وەكو ئەوەی توسل بكرێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ یان خاتری پێغەمبەر ﷺ .**

**٣-پارانەوە لە مردوو بكرێت بەوەی كە هاناو هاواری بۆ ئەو ببەی .**

**٤-دوعاو پارانەوە لە خۆت بكەی بەوەی كە بمریت لەبەر ناخۆشی نەهامەتی ژیانی دونیا یان تووشی زەرەرێك بووی .**

**لە (ئەنس كوری مالك ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((لا يَتَمَنَّيَنَّ أحَدُكُمُ المَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ به، فإنْ كانَ لا بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أحْيِنِي ما كانَتِ الحَياةُ خَيْرًا لِي، وتَوَفَّنِي إذا كانَتِ الوَفاةُ خَيْرًا لِي )) [35] واتە : با هیچ كەسێك لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت ، لە بەر ئەوەی كە تووشی بەلا و نەهامەتی زیانێك بوو ، ئەگەر زۆر پێویست بوو ئاوات بخوازێت ، ئەوا با بلێت : خوایە ئەگەر ژیان چاكترە بۆم ئەوا بمژێینە ، ئەگەر مردنیش چاكترە بۆم بممرێینە.

[35] -صحيح مسلم برقم ( ٢٦٨٠ ).

٥-دوعاو پارانەوە کردن بەوەی کە لە (خوای گەورە) بپاڕێیەوە کە سزاکەت بۆ پێش بخات لە دونیادا .

لە (ئەنس کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : ((أنَّ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ عَادَ رَجُلًا مِنَ المُسْلِمِينَ قدْ خَفَتَ فَصَارَ مِثْلَ الفَرْخِ، فَقالَ له رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: هلْ كُنْتَ تَدْعُو بشَيءٍ، أَوْ تَسْأَلُهُ إيَّاهُ؟ قالَ: نَعَمْ؛ كُنْتُ أَقُولُ: اللَّهُمَّ ما كُنْتَ مُعَاقِبِي به في الآخِرَةِ، فَعَجِّلْهُ لي في الدُّنْيَا، فَقالَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: سُبْحَانَ اللهِ! لا تُطِيقُهُ -أَوْ لا تَسْتَطِيعُهُ- أَفَلَا قُلْتَ: اللَّهُمَّ آتِنَا في الدُّنْيَا حَسَنَةً، وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، قالَ: فَدَعَا اللَّهَ له، فَشَفَاهُ)) .[٣٦] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆلای پیاوێك کە نەخۆش بوو ، زۆر لاواز بو بوو بچووك بو بووە ، وەك بەچکەی باڵندە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە هیچ دوعاو پارانەوەت دەکرد یان داوای هیچت دەکرد ..؟! پیاوە نەخۆشەکە ووتی : دەمووت خوایە ئەو تۆڵە و سزایە لە قیامەت لێم دەستێنی بۆم پێش بخە بۆ ژیانی دونیا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( سبحان الله تۆ بەرگە ناگریت ، ئەی بۆ نەت ووت : (اللَّهُمَّ آتِنَا في الدُّنْيَا حَسَنَةً، وفي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) واتە: خودایە لە دونیا چاکەمان پێببەخشە لە قیامەتیش هەر بە چاکە لە ئاگری دۆزەخدا بمانپارێزە ، پیاوەکە ئەم دوعایەی کرد چابوویەوە (خوای گەورە ) شفای بۆ رەوانە کرد ..؟!

٦-دوعاو پارانەوە لە شتێك کە ئەستەم بێت لە دونیادا رووی نەدابێ ، وە لە رووی شەرعەو عەقل و عادەتیشەوە رێك نەبێت و نەگونجێت ، بۆ نموونە وەکو ئەو دوعایە بکا داوای نەمری بکات لە ژیانی دونیادا یان داوا لە (خوای گەورە) بکات کە پێغەمبەرایەتی پێ بدات ، یان داوا بکات کە قیامەت هەڵنەسێت و ئەم جۆرە دوعایانە سنوور بەزاندنە ..؟!

٧-لە کاتی دوعاو پارانەوەدا نابێت زۆر لە خۆ بکەیت بۆ گریان ، بۆ نموونە هەندێك خەڵك هەن گریانیان نایەت لە کاتی دوعاو پارانەوەدا زۆر لە خۆ دەکەن ئەمەش کارو کردەوەیەکی ریاییە ، یان بە دەنگی بەرز دوعاو پارانەوە بکەیت ..؟!

[٣٦] صحیح مسلم برقم (٢٦٨٨).



٨–دوعا و پارانەوە نابێت داواکردنەکە خراپە کاری بێت ، بۆ نموونە دوعا کە فاسد و خراپ بێت ، وەکو ئەوەی داوای مال و سامان بکات بۆ خۆ گەورە کردن ، یان بۆ دەسەلات وەرگرتن بۆ سەرپێچیەکان و زولم ستەم کردن لە خەلکی یان دوعا کردنێك لە کەسێك کە هیچ ستەمێکی لیٚ نەکردووی یان هیچ مافێکت لای نیە ..؟!



٩–سنوور بەزاندن لە دوعاو پارانەوە ئەویش بریتیە لە بیدعەو داهێنراوەکان لە شەرعدا ، بۆنموونە وەك : أ–بە کۆمەل لە شوێنێکی تایبەتدا بە کەسێك دوعا بکات ئەوانی تریش دەست بەرز بکەن لە دوایی بلێن ئامین ، چونکە لە سووننەت نەهاتووە ، ب– یان لە دوای دوعاو پارانەوەدا دەست بە دەم چاو دابهێنین وەك مسح کردن دەم چاو بە هەردوو دەست ،ج– یان دوعاو پارنەوە کردن لە لای گۆری پیاو چاکان ..؟!



## ئادابەکانی دوعاو پارانەوە بە گشتی :

**یەکەم : سەرەتا دەست پێکردن بە سوپاس و ستایشی (خوای گەورە ) صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەمەش کۆتایی پێ دەهێنێت .**

**لە (عبدالله کوری مسعود) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت :** ((كنتُ أصلِّي فلمَّا جلستُ بدأتُ بالثَّناءِ على اللَّهِ تعالى ثمَّ بالصَّلاةِ على النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ ثمَّ دعوتُ لِنفسي فقالَ النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ سَل تُعطَه سَل تُعطَه)) .[37] **واتە: نوێژم دەکرد ، پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو پێشەوا (ابو بکر ) و (عمر ) ی لەگەل بوو ، دانیشتم بە سوپاسو ستایشی (خوای گەورە) دەست پێ کرد ، لە پاشدا بە صەلاوتدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ ، ئینجا دوعا پارانەوەم بۆ خۆم کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بپارێرەوە و داوا بکە پێت دەدرێت بپارێرەوە و داوا بکە پێت دەدرێت ..؟!**

**دووەم : دوعاو پارانەوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشی دا :**

**لە (ابو هریرة ) –خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((مَن سَرَّهُ أن يستجيبَ اللَّهُ له عندَ الشدائدِ؛ فلْيُكْثِرِ الدعاءَ في الرَّخاءِ )) .[38] **واتە : هەر کەسێك پێی خۆشە لە کاتی نەهامەتی و کارەسات و تەنگانەدا (خوای گەورە) دوعاو پارانەوەی لێ قبول بکات با لە کاتی خۆشی و تەندروست و خۆشگوزەرانی دا بپارێتەوە ..؟!**

**سێ یەم: لە کەس و کارو مال و سامان و مندال ونەفسی خۆشی نە پارێتەوە و دوعاویان لێ نەکات :**

**لە (جابری کوری عبدالله ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت :** ((من هذا اللاعنُ بعيرَه ؟ ! انزِلْ عنه، فلا تصحَبْنا بملعونٍ، لا تدْعوا على أنفُسِكم و لا تدعوا على أولادِكم، و لا تدْعوا على أموالِكم، لا توافِقوا من اللهِ ساعةً يُسأَلُ فيها عطاءٌ، فيَستجيبُ لكم)).[39] **واتە: دەربارەی ئەو پیاوەی کە لەعنەتی لە ووشترەکەی خۆی کرد ، دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە کێ یە نەفەرت لە ووشترەکەی دەکات ..؟! پیاوەکە ووتی : منم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش فەرمووی : لە سەری دابەزە نەفەرت لێ کراوێکتان با لەگەلدا نەبێت ، و مەیهێنە دوعا لە خۆتان مەکەن ، وە دوعا لە مندالەکانتان مەکەن ، وە دوعا لە سامانەکانتان مەکەن ، نە با هاوگیری کاتێك ببن کە ئەگەر بەندە تیایدا لە پەروەردگاری خۆی بپارێتەوە وەلام دەرێتەوە ..؟!**

---

[37] -سنن الترمذي برقم (٥٩٣).
[38] - سنن الترمذي برقم (٣٣٨٢).
[39] -صحيح مسلم برقم (٣٠٠٩).

### چوارەم : دەنگی لە کاتی پارانەوە دا نزم بکاتەوە لە نێوان ئاشکرا کردن و پەنهاندا :

قال تعالی: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعًا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝٥٥﴾ [الأَعۡرَاف : ٥٥] واتە: [ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] ئێوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بە زەلیلی و ملکەچی وە بە نهێنی نەك بە دەنگی بەرزو هاوار کردن [ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٥٥) ] بەڕاستی خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێ کە سنوور ئەبەزێنن لە پاڕانەوەندا، وەکو داواکردنی کۆشکێکی سپی لەلای ڕاستی بەهەشت، یان داوای شتێکی وا بکەن کە مافی ئەوان نەبێت، یاخود دەنگ زۆر بەرز بکەنەوەو هاوار بکەن لە کاتی پاڕانەوەدا..؟!

لە (ابو موسی الاشعری ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت : ((كُنَّا مع النبيِّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ في سَفَرٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بالتَّكْبِيرِ، فَقالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ: أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا علَى أَنْفُسِكُمْ، إنَّكُمْ ليسَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا، إنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا، وَهو معكُمْ قالَ وَأَنَا خَلْفَهُ، وَأَنَا أَقُولُ: لا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا باللَّهِ، فَقالَ يا عَبْدَ اللهِ بنَ قَيْسٍ: أَلَا أَدُلُّكَ علَى كَنْزٍ مِن كُنُوزِ الجَنَّةِ، فَقُلتُ: بَلَى، يا رَسولَ اللهِ، قالَ: قُلْ: لا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إلَّا باللَّهِ)).[40] واتە: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا ، خەلکی بەدەنگی بەرزەوە (الله اکبر)یان دەکرد ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : خەلکینە لە سەر خۆ بن ، خۆ ئێوە بانگی کەسێك ناکەن کە کەر نادیار بێت ، ئێوە بانگی کەسێك دەکەن بیسەرە و نزیکە لە ئێوە هەمیشە لە گەلتانە ، (بو موسی الاشعری ) دەلێت : منیش لە دایەوەی بووم دەم ووت : (لا حول ولا قوة إلا بالله ) ، فەرمووی : ئەی (عبدالله کوری قیس ) ئایا گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی بەهەشت پێشان نەدەم ..؟!ووتم : بلێ : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بلێ (لا حول ولا قوة إلا بالله )واتە : هیچ هێزو دەسەلاتێك نیە تەنها (خوای گەورە ) نەبێت ..؟!

[40] ـ صحيح مسلم برقم (٢٧٠٤).

**پێنچەم : (الضراعة) واتە : ملكەچی كروزانەوە زەلیلی و دەبڕین بۆ لای (خوای گەورە ):**

قال تعالى: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ﴾ [الأَعۡرَاف : ٢٠٥] واتە: وە زیكری خوای گەورەش بكە لە دڵی خۆتدا بە ملكەچی و زەلیلی و نهێنی، واتە: بەدەنگی نزم..؟!

قال تعالى: ﴿قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٦٣﴾ [الأَنۡعَام : ٦٣] واتە: [ قُلْ مَنْ يُنَجِّيكُمْ مِنْ ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ ] ئەی محمد- صلى الله عليه وسلم - پێیان بفەرمە: كێ هەیە ئێوە ڕزگار بكات لە تاریكیەكانی وشكانی و دەریادا [ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] كە دوعا ئەكەن وە لە خوای گەورە ئەپاڕێنەوە بە زەلیلی و بەملكەچی و بێدەسەڵاتی وە بە نهێنی، یان بە ئاشكراو نهێنی [ لَئِنْ أَنْجَانَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ (٦٣) ] ئەڵێن: ئەگەر خوای گەورە لەم ناخۆشی و سەغڵەتی و تاریكییانە ڕزگارمان بكات ئەوا لەو كەسانەی ئەبین كە شوكرانەبژێری خوای گەورە ئەكەین..؟!

**شەشەم : (إلحاح) واتە: لە دوعاو پاڕانەوە دا زۆر داوا بكە لە پەروەردگار زۆر بپاڕێتەوە :**

**لە (ابو هريره ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((يا أيُّها النَّاسُ إنَّ اللَّهَ طيِّبٌ لا يقبلُ إلَّا طيِّبًا، وإنَّ اللَّهَ أمرَ المؤمنينَ بما أمرَ بِه المرسلينَ فقالَ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ وقالَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ قالَ وذَكرَ الرَّجلَ يُطيلُ السَّفرَ أشعثَ أغبرَ يمدُّ يدَه إلى السَّماءِ يا ربِّ يا ربِّ ومطعمُه حرامٌ ومشربُه حرامٌ وملبسُه حرامٌ وغذِّيَ بالحرامِ فأنَّى يستجابُ لذلِك)).[41] **واتە: ئەی خەلكینە (خوای گەورە) بۆ خۆی پاك و خاوێنە هەر چی پاك و خاوێن و حەلال نەبێ قبولی ناكات ، بێ گومان (خوای گەورە) هەر فەرمانێكی بە پێغەمبەران كردبێ ، هەمان فەرمانیشی بە باوەرداران كردووە ،** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٥١﴾ [المُؤۡمِنُون : ٥١] ، **واتە: ئەی پێغەمبەر بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك ، كارو كردەوەی باش بكەن ، بەراستی من بەوەی ئێوە دەیكەن ئاگادارم ، هەروەها دەفەرموویێت :** قال تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٧٢] ، **واتە: ئەی ئەوانە باوەرتان هێناوە ، بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك كە ئێمە كردومانن بە رزق و ڕۆزی ئێوە ، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێكی كرد دەچێ بۆ سەفەری دوور و درێژ قژی گڤ دەبێ تێك دە ئالێ ،وە چلك تەپ و تۆزی لێ دەنیشێ دەستی بەرز دەكاتەوە بۆ ئاسمان و دەپاڕێتەوە دەلێت : ئەی پەروەردگارم ، خواردن و خواردنەوەی حەرامە ، پۆشاكی حەرامە ، بەحەرام گۆشكراوە ، دەی ئیتر پارنەوەی چۆن لێ وەردەگیرێ یان ئیتر چۆن وەلامی پارانەوەكەی دەدرێتەوە ..؟!**

[41] - السنن الترمذي برقم ( ٢٩٨٩).

## حەوتەم : (توسل ) كردن بۆ لای (خوای گەورە) بەلام (توسل) ی دەبێت شەرعی بێ :

له (راغبی الاصفهانی ) – ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلیٚت : (الوسیلة ) واتە: هەولدانه بۆ گەیشت بە حەزو ئارەزوو ویستەوە، وە ئەمە تایبەت ترە لە (الوصیلة ) ، **چونكە مانای حەز و ویستی تیدایە** ، **كە (خوای گەورە) دەفەرموویێت** : قال تعالی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٣٥﴾ [المَائـِدَة : ٣٥] واته : [ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ ] ئەی باوەڕداران تەقوای خوای گەورە بكەن [ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ ] وە هەموو وەسیلەو هۆكارێكی شەرعی بگرنەبەرو داوای بكەن كە بتانگەیەنێ بەخواو لە خوای گەورەتان نزیك بكاتەوە، وە خۆتان لە خوای گەورە نزیك بكەنەوە بە گوێڕایەڵی كردنی و كاركردن بە رازی بوونی، وەسیلە بەرزترین پلەو شوێنە لە بەهەشت، وە نزیكترین شوێنی بەهەشتە لە عەرشی پیرۆزی خوای گەورە كە تایبەتە بە پێغەمبەری خوا- صلی الله علیه وسلم - [ وَجَاهِدُوا فِي سَبِيلِهِ ] وە جیهاد بكەن لە پێناو خوای گەورەدا [ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٣٥) ] بەڵكو خوای گەورە سەرفرازتان بكات لە دونیاو قیامەت..؟!

**دەلیٚت : وە راستی (الوسیله ) گرتن بۆ لای (خوای گەورە) چاودێری كردنی ڕێگاكەیەتی بە زانست و پەرستش و هەولدانه بۆ پلە بەرزەكانی شەریعەت ، كە ئەمیش وەك نزیك بوونەوە وایە ، وە كەسی وەسیلە بە كارهێنەر ئەو كەسەیە بە حەزو ئومێدەوە بەرەو (خوای گەورە) دەچێت .** [٤٢]

**له (ئەنسی كوری مالك ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلیٚت :** ((نَّهُ كانَ معَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليه وسلم جالسًا ورجلٌ يصلِّي ثمَّ دعا اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّ لَكَ الحمدُ لا إلَهَ إلَّا أنتَ المنَّانُ بديعُ السَّمواتِ والأرضِ يا ذا الجلالِ والإكرامِ يا حيُّ يا قيُّومُ فقالَ النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وسلَّمَ لقد دعا اللَّهَ باسمِهِ العظيمِ الَّذي إذا دعيَ بِهِ أجابَ وإذا سئلَ بِهِ أعطى )) . [٤٣]

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مەزگەوت ، پیاوێك نوێژی دەكرد دەپاڕایەوە دەی ووت : (اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّ لَكَ الحمدُ لا إلَهَ إلَّا أنتَ المنَّانُ بديعُ السَّمواتِ والأرضِ يا ذا الجلالِ والإكرامِ يا حيُّ يا قيُّومُ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەو پیاوە بەناوە گەورە و شكۆمەندەكەی خوا پاڕایەوە ، كە هەر كەسیٚ بە ناوەوە لێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناكات و پاڕانەوەكەی قبول یان گیرا دەكات ، هەر كەسیٚ بە و ناوەوە داوای لیٚ بكات ئەیدرێتیٚ ..؟!

---

[٤٢]- مفردات غريب ألفاظ القرآن ص ٨٧١.
[٤٣]-سنن الترمذي برقم (٣٥٤٤).

**هەشتەم : (الاعتراف ) دان پێدانان بە تاوان گوناه ، وەنیعەتەکانی پەروەردگار لە کاتی پارانەوەدا :**

له (شداد بن أوس )– خوا لیٚ رازی بێت – دەلیٚت : ((ألا أدلُّكَ على سيِّدِ الاستِغفارِ : اللَّهمَّ أنتَ ربِّي، لا إلَهَ إلَّا أنتَ، خَلقتَني وأنا عبدُكَ، وأنا على عَهْدِكَ ووعدِكَ ما استطعتُ ، أعوذُ بِكَ من شرِّ ما صنعتُ، وأبوءُ لَكَ بنعمتِكَ عليَّ، وأعترفُ بِذنوبي، فاغفِر لي ذنوبي إنَّهُ لا يَغفرُ الذُّنوبَ إلَّا أنتَ، لا يقولُها أحدُكُم حينَ يُمسي فيأتي علَيهِ قَدرٌ قبلَ أن يُصبِحَ إلَّا وجبَت لَهُ الجنَّةُ، ولا يقولُها حينَ يصبحُ فيأتي علَيهِ قَدرٌ قبلَ أن يُمسيَ إلَّا وجبت لَهُ الجنَّةُ )) .[44] واته: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە : ئایا رێنموونیت بکەم بۆ گەورەترین دوعاو پارانەوەی لیٚ خۆشبوون : (اللَّهمَّ أنتَ ربِّي، لا إلَهَ إلَّا أنتَ، خَلقتَني وأنا عبدُكَ، وأنا على عَهْدِكَ ووعدِكَ ما استطعتُ ، أعوذُ بِكَ من شرِّ ما صنعتُ، وأبوءُ لَكَ بنعمتِكَ عليَّ، وأعترفُ بِذنوبي، فاغفِر لي ذنوبي إنَّهُ لا يَغفرُ الذُّنوبَ إلَّا أنتَ ) واته: خودایه تۆ پەروەردگاری منی ، تۆ دروستت کردووەم ن منیش بەندەی تۆم ، خودایه من لە سەر بەلیٚن و پەیمانەکەی خۆمم کە بە تۆ داوە ئەوەندەی لە توانامدا هەبیٚ ، خودایه پەنات پیٚ دەگرم لە شەر و خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە ، خو دایه دان دەنیٚم کە تۆ بە خشش و نیعمەتت بەسەردا رشتووم ، دانیش بە تاوانە کاندا دەنیٚم و داوای لیٚ خۆشبوونت لیٚ دەکەم ، هیچ کەسێکیش لە تاوانەکان خۆش نابیٚ جگە لە تۆ ، فەرمووی : هەر کەسیٚ ئێوارەی لیٚهات با بیخوێنیٚت ئەو شەو ، بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ، هەر کەس کەوتە بەیانی با بیخوێنێت ئەو رۆژە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ..؟!

[44] - سنن الترمذي برقم (٣٣٩٣).

**نۆیەم: (السجع ) واتە: زۆر لە خۆنەکردن بۆ ڕێکخستنی سەر وا لە کاتی دوعاو پارانەوەدا:**

**لە (عبدالله کوری عباس ) خوا لیٚ رازی بیٚت – دەگیٚریٚتەوە دەلیٚت :** ((حَدِّثِ النَّاسَ كُلَّ جُمُعَةٍ مَرَّةً، فإنْ أبَيْتَ فَمَرَّتَيْنِ، فإنْ أكْثَرْتَ فَثَلَاثَ مِرَارٍ، ولَا تُمِلَّ النَّاسَ هذا القُرْآنَ، ولَا أُلْفِيَنَّكَ تَأْتي القَوْمَ وهُمْ في حَدِيثٍ مِن حَدِيثِهِمْ، فَتَقُصُّ عليهم، فَتَقْطَعُ عليهم حَدِيثَهُمْ فَتُمِلُّهُمْ، ولَكِنْ أنْصِتْ، فَإِذَا أمَرُوكَ فَحَدِّثْهُمْ وهُمْ يَشْتَهُونَهُ، فَانْظُرِ السَّجْعَ مِنَ الدُّعَاءِ فَاجْتَنِبْهُ؛ فإنِّي عَهِدْتُ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ وأَصْحَابَهُ لا يَفْعَلُونَ إلَّا ذلكَ. يَعْنِي لا يَفْعَلُونَ إلَّا ذلكَ الِاجْتِنَابَ )) .[45]

واتە : ووتارو ئامۆژگاری خەاکب بکە هەموو هەفتەیەك جارێك ، ئەگەرنا دوو جار ، ئەگەر ویستت سیٚ جار ، وە خەلکی بیٚ تاقەت و وەرس مەکە لەم قورئانە ، وە نەکەیت بچیتە لای قەومێك کە لە گەرمەی قسە کردندا بوون ، تۆش قسەیان بۆ بکەیت و قسەکەیان پیٚ ببریت، وە وەرست و بیٚ تاقاتیان بکەیت ، بەلام گویٚ بگرە ئەگەر ڕێیان پیٚ دایت قسەیان بۆ بکە لەو کاتەدا کە حەزی لیٚ دەکەن ، وە خۆت بپارێزە لە زۆر لە خۆ کردنی ڕێکخستن لە پارانەوەدا ، چونکە من بیستوومە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەلانی هەر ئەوەیان دەکرد ، خۆیان بەدوور دەگرد یان دەپاراست لیٚی ..؟!

**دەیەم : ڕوو کردنە قیبلە کاتی دوعاو پارانەوەدا :**

**لە (عبدالله بن زید ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەگیٚریٚتەوە دەلیٚت :** ((خَرَجَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ إلى هذا المُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَدَعَا واسْتَسْقَى، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ وقَلَبَ رِدَاءَهُ )) .[46] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەر بەرەو شوێنی نوێژگە بۆ نوێژەبارانەو داوای باران بارین کرد لە (خوای گەورە ) جا پارایەوە داوایی کرد ، پاشان ڕووی کردە قیبلە و پۆشاکەکەی بەری هەلگێرایەوە.

[45] -صحيح البخاري برقم ( ٦٣٣٧ ).
[46] - صحيح البخاري برقم (٦٣٤٣).

**يانزەم : دەست بەرز کردنەوە لە کاتی دوعاو پارانەوە دا :**

**لە (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لیٚ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت :** ((دعا النبي ﷺ ثم رفع يديه ، ورأيت بياض إبطيه)) .[٤٧] **واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ پارایەوە پاشان دەستەکانی بەرز کردەوە و سپیایی بالە کانیم بینی ..؟!**

**لە (سلماني الفارسي ) –خوا لیٚ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((إنَّ اللهَ حَيِيٌّ كريمٌ يستحيي إذا رفع الرجلُ إليه يدَيه أن يردَّهما صِفرًا خائبتَينِ )) .[٤٨] **واتە : پەروەردگاری بەرزو شکۆمەندتان زۆر بە حەیاو بەرێزە و نازو نیعمەت بەخشە بە بەندەکانی ، حەیا دەکا ئەگەر بەندەیەکی ئیمانداری دەستەکانی بۆ بەرزبکاتەوە بە بە تالی بیان گەرێنیتەوە..؟!**

**دووانزەم : دەست نویٚژ شتن پێش دوعاو پارانەوە ئەگەر توانرا باشترە :**

**لە (ابو موسى الاشعرى ) – خوا لیٚ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت :** ((لَمَّا فَرَغَ النَّبيُّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ مِن حُنَيْنٍ، بَعَثَ أبَا عَامِرٍ علَى جَيْشٍ إلى أوْطَاسٍ ، فَلَقِيَ دُرَيْدَ بنَ الصِّمَّةِ، فَقُتِلَ دُرَيْدٌ، وهَزَمَ اللَّهُ أصْحَابَهُ. قالَ أبو مُوسَى: وبَعَثَنِي مع أبِي عَامِرٍ، فَرُمِيَ أبو عَامِرٍ في رُكْبَتِهِ؛ رَمَاهُ جُشَمِيٌّ بسَهْمٍ فأثْبَتَهُ في رُكْبَتِهِ، فَانْتَهَيْتُ إلَيْهِ، فَقُلتُ: يا عَمِّ، مَن رَمَاكَ؟ فأشَارَ إلى أبِي مُوسَى فَقالَ: ذَاكَ قَاتِلِي الذي رَمَانِي، فَقَصَدْتُ له فَلَحِقْتُهُ، فَلَمَّا رَآنِي ولَّى، فَاتَّبَعْتُهُ وجَعَلْتُ أقُولُ له: ألَا تَسْتَحْيِي! ألَا تَثْبُتُ! فَكَفَّ، فَاخْتَلَفْنَا ضَرْبَتَيْنِ بالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ، ثُمَّ قُلتُ لأبِي عَامِرٍ: قَتَلَ اللَّهُ صَاحِبَكَ، قالَ: فَانْزِعْ هذا السَّهْمَ، فَنَزَعْتُهُ فَنَزَا منه المَاءُ، قالَ: يا ابْنَ أخِي، أقْرِئِ النَّبيَّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ السَّلَامَ، وقُلْ له: اسْتَغْفِرْ لي. واسْتَخْلَفَنِي أبو عَامِرٍ علَى النَّاسِ، فَمَكُثَ يَسِيرًا ثُمَّ مَاتَ، فَرَجَعْتُ فَدَخَلْتُ علَى النَّبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ في بَيْتِهِ علَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وعليه فِرَاشٌ، قدْ أثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بظَهْرِهِ وجَنْبَيْهِ، فأخْبَرْتُهُ بخَبَرِنَا وخَبَرِ أبِي عَامِرٍ، وقالَ: قُلْ له: اسْتَغْفِرْ لِي، فَدَعَا بمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَقالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أبِي عَامِرٍ. ورَأَيْتُ بَيَاضَ إبْطَيْهِ، ثُمَّ قالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَومَ القِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِن خَلْقِكَ مِنَ النَّاسِ. فَقُلتُ: ولِي فَاسْتَغْفِرْ، فَقالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وأَدْخِلْهُ يَومَ القِيَامَةِ مُدْخَلًا كَرِيمًا. قالَ أبو بُرْدَةَ: إحْدَاهُما لأبِي عَامِرٍ، والأُخْرَى لأبِي مُوسَى)) .[٤٩]

---

[٤٧] صحيح البخاري برقم (٦٣٨٣)، وصحيح مسلم برقم (٢٤٩٨).
[٤٨] - سنن الترمذي برقم (٣٥٥٦).
[٤٩] -صحيح البخاري برقم (٤٣٢٣) ، و صحيح مسلم برقم (٢٤٩٨).



واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی حنین تەواو بوو ، (ابا عامر )ی بە سەرکردەی سوپایەك

ڕەوانەی (أوطاس) ی کرد ، لەوی گەیشت بە ( (درید بن الصمه ) ، (درید ) کوژرا (خوای گەورە ) سوپاکەی شکاندن ،

(ابو موسى ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل (ابا عامر ) ناردمی ، جا تیرێك بەر ئەژنۆی (ابا عامر ) کەوت ، کە

پیاوێکی (جەشمی ) بە کەوانەکەی تیری گرت و نای بە ئەژنۆیەوەو پێکای ، منیش گەیشتمە سەریو پێم ووت : ئەی

مامە کێ تیری تێ گرتیت ..؟! ئەویش ئاماژەی بۆ (ابو موسا ) کردو ووتی : ئەوە بکوژی منەو تیری تێ گرتم ، منیش

شوێنی کەوتم ، کاتێ منی بینی پشتی هەلکرد ، منیش شوێنی کەوتم و پێم دەووت : ئایا شەرم ناکەیت ..!! ئایا

ڕانەوەستیت ..؟! ئەویش وەستا و بە شمشێر لەگەل یەك شەرمان کرد منیش کوشتم ، پاشات بە (ابا عامر ) ووت :

(خوای گەورە ) دوژمنەکەتی لە ناو برد ، ووتی : دە وەرە ئەم تیرە دەربێنە منیش دەرم هێناو ئاوی لێ دەر هات ،

ووتی : ئەی کوری برام بچۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بلێ : (ابا عامر ) دەیووت :

داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکات ، دەفەرمووێت :وە (ابا عامر ) منی کردە ئەمیر بەسەر خەلکەکەوە ، ئەوەندەی پیچنەچوو

پاشان مرد . منیش گەرامەوە و چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ماڵەوە لەسەر جێگایەکی لمێن ڕاکشابوو ،

پۆشاکێکی دابوو بە خۆیدا شوێنەواری لمەکە لە پشت و لای تەنیشتی دا دەرچوو بوو ، منیش هەوالی خۆمان و (ابا عامر

) پێ گەیاندوو ووتم : ووتویەتی پێی بلێ داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکات ، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئاوی کردو

دەستنوێژی پێ گرت و پاشان دەستەکانی بەرز کردەوەو فەرمووی : خوایە لە بەندەت (ابا عامر ) خۆش ببە ، وە

سپیایی بالە کانیم بینی ، پاشان فەرمووی : خوایە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخەرە سەروی زۆرێك لە دروست کراوەکانت ، یان

زۆرێك لە خەلکی ، منیش ووتم : بۆ منیش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوایی لێ خۆشبوونم بۆ بکە ، فەرمووی : خوایە

لە گوناهی (عبدالله کوری قیس ) خۆشبە و لە ڕۆژی قیامەتدا بە چوونە ژوورەوەیەکی ڕێزلی گیرو بیخەرە ژوورەوە ..؟!



**سیانزەم : گریان لە کاتی دوعاو پارانەوە دا لە ترسی (خوای گەورە):**

له (عبدالله كوری عمر ) – خوا لیٚ رازی بێت – دە گێرێتەوە دەلێت : ((أنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ تَلا قَوْلَ اللهِ عزَّ وجلَّ في إبْراهِيمَ: {رَبِّ إنَّهُنَّ أضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فمَن تَبِعَنِي فإنَّه مِنِّي} [إبراهيم: ٣٦] الآيَةَ، وقالَ عِيسَى عليه السَّلامُ: {إنْ تُعَذِّبْهُمْ فإنَّهُمْ عِبادُكَ وإنْ تَغْفِرْ لهمْ فإنَّكَ أنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ} [المائدة: ١١٨]، فَرَفَعَ يَدَيْهِ وقالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتي أُمَّتي، وبَكَى، فقالَ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: يا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إلى مُحَمَّدٍ، ورَبُّكَ أعْلَمُ، فَسَلْهُ ما يُبْكِيكَ؟ فأتاهُ جِبْرِيلُ عليه الصَّلاةُ والسَّلامُ، فَسَأَلَهُ فأخْبَرَهُ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ بما قالَ، وهو أعْلَمُ، فقالَ اللَّهُ: يا جِبْرِيلُ، اذْهَبْ إلى مُحَمَّدٍ، فَقُلْ: إنَّا سَنُرْضِيكَ في أُمَّتِكَ، ولا نَسُوءُكَ )) .[٥٠] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی (خوای گەورە ) لە زمانی (ئیبراهیم ) – علیه السلام – دەخوێندەوەو کە دەفەرمووی : {رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ فمَن تَبِعَنِي فإنَّه مِنِّي} [إبراهيم: ٣٦] واتە: [ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ ] ئەی پەروەردگار ئەم بتانە بوونەتە هۆی گومڕا کردنی زۆرێك لە خەڵکی [ فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي ] جا هەر کەسێك شوێن من بکەوێ ئەوە لە منە [ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣٦) ] وە هەر کەسێك سەرپێچیم بکات ئەوە تۆ ئەی پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو و بە بەزەییت (لێرە سەرپێچی مەبەست پێی تاوانە، نەك بە درۆزانین و شوێن نەکەوتن)..؟! وە دەربارەی فەرموودەی (عیسی) – علیه السلام– کە فەرموویەتی : {إنْ تُعَذِّبْهُمْ فإنَّهُمْ عِبادُكَ وإنْ تَغْفِرْ لهمْ فإنَّكَ أنْتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ} [المائدة: ١١٨] واتە: [ إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ] ئەی پەروەردگار ئەگەر سزایان بدەی ئەوا ئەوان بەندەی تۆن [ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ ] وە ئەگەر لێشیان خۆشبی [ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١١٨) ] ئەوە تۆ زۆر بە عیزەت و باڵادەستی وە زۆر کاربەجێی..؟! ، پاشان دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی : خوایە ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم .. وە گریا .. (خوای گەورە) فەرمووی : ئەی جبریل بچۆ بۆ لای محمد ﷺ وە پەروەردگارت زاناترە بۆ چی دەگری، پێی بلێ : چی دەتگریەنێت ..؟! وە جبرایلیش هات و پرسیاری لێ کرد ..؟! پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا بەوەی کە فەرموویەتی و (خوای گەورە ) زاناترە، (خوای گەورە) فەرمووی : ئەی جبریل برۆ بۆ لای محمد و پێی بلێ : ئێمە رازیت دەکەین بەرامبەری ئوممەتەکەت و دڵ شکاوت ناکەین ..؟!

[٥٠] صحیح مسلم برقم (٢٠٢).

## چواردەم : دەرخستنی هەژاری و نەخۆشی لە کاتی تەنگانەدا داوا لە (خوای گەورە ) بکەین :

قال تعالى: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾﴾ [الأَنبِيَاء : ٨٣] واته : {خوای گەورە شیفای ئەیوب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم – دەدات} [ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ ] وە ئەیوب پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کاتێك لە خوای گەورە پاڕایەوە [ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ ] کە من تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوومە کە ئەوتریَ: حەوت ساڵ یان هەژدە ساڵ نەخۆش بووە [ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ (٨٣) ] وە هەر تۆ خوایە لە هەموو بەڕەحم و سۆزەکان بەڕەحم و سۆزو میهرەبانتری..؟!

قال تعالى: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾﴾ [الأَنبِيَاء : ٨٩] واته : {زەکەریا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - داوای منداڵ لە خوا دەکات} [ وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ ] وە زەکەریا پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - کاتێك لە پەروەردگاری پاڕایەوە [ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا ] ئەی پەروەردگار بەتەنها بەبێ منداڵ جێم مەهێڵەو منداڵم پێ ببەخشە [ وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ (٨٩) ] وە تۆ باشترین خوای کە لە پاش مرۆڤ میراتگری بۆ جێدێلیت، میراتگر بۆ زانست و زانیاری و دین و پێغەمبەرایەتی..؟!

قال تعالى: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِيٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾﴾ [إِبْرَاهِيم : ٣٧] واته : [ رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ ] ئەی پەروەردگار من نەوەکانم (هاجەری خێزانم و ئیسماعیلی کوڕم) جێگیرو نیشتەجێ کردووە لە دۆڵێکدا کە هیچ کشتوکاڵێکی لێ نیە لەلای ماڵەکەی تۆ لە مەککە کە موحەڕەمە، واته: حەرامە لەسەر ستەمکاران و کافران کە بێڕێزی بەرامبەری بکەن یان سووکایەتی پێ بکەن [ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ ] ئەی پەروەردگار بۆیە لەوێ جێگیرو نیشتەجێم کردوون تا نوێژ بۆ تۆ ئەنجام بدەن [ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ ] وە تۆش وا لە دڵی خەڵکی بکە کە دڵیان ڕاکێشی بۆ لای ئەو ماڵە بۆ ئەوەی حەج بکەن و عیبادەتی تۆی لێ بکەن [ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ ] وە ڕزقیان بدە لە بەرووبوومەکان [ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ (٣٧) ] بەڵکو ئەوانیش شوکرانەبژێری تۆ بکەن..؟!



**پانزەم : ئەوە کەسەی دەپارێتەوە سەرەتا بۆ خۆی دواتریش بۆ براکەی بپارێتەوە :**

**لە (أبی بن کعب ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت :** ((أنَّ رسولَ اللهِ صلَّى اللهُ علَيهِ وسلَّمَ كان إذا ذكَر أحدًا فدعا لهُ بدأَ بنفسِهِ)) . [٥١] **واتە : کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی یەکێکی دەکرد و بۆی دەپاریەوە لە خۆیەوە دەست پیّ دەکرد ..؟!**

**شانزەم : پێویستە لەکاتی دوعاو پارانەوە سنوور نەبەزێنیت :**

**لە (سعد کوری ابی وقاص) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

(( سيكونُ قومٌ يَعتَدُونُ في الدعاءِ)) . [٥٢] **واتە: کەسانێك پەیدا دەبن لە ئوممەتی من سنوور دەبەزێنن لەکاتی دوعاو پارانەوەدا..؟!**



[٥١]- سنن الترمذي برقم (٣٣٨٥).
[٥٢]- الجامع الصغير برقم (٤٧٥٩).

**حەفدەم :پەشیمان بوونەوە لەگوناهو تاوان یان لەو کەسانەی ستەمت لیٚ کردوون :**

لة (ابو هريرة ) – **خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((يا أيُّها النَّاسُ إنَّ اللَّهَ طيِّبٌ لا يقبلُ إلَّا طيِّبًا، وإنَّ اللَّهَ أمرَ المؤمنينَ بما أمرَ بِه المرسلينَ فقالَ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ وقالَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ قالَ وذَكَرَ الرَّجلَ يُطيلُ السَّفرَ أشعثَ أغبرَ يمدُّ يدَه إلى السَّماءِ يا ربِّ يا ربِّ ومطعمُه حرامٌ ومشربُه حرامٌ وملبسُه حرامٌ وغذِّيَ بالحرامِ فأنَّى يستجابُ لذلِك)). [٥٣] **واتە: ئەی خەلکینە (خوای گەورە) بۆ خۆی پاك و خاویٚنە هەر چی پاك خاویٚن و حەلال نەبیٚ قبولی ناكات ، بیٚ گومان (خوای گەورە) هەر فەرمانیٚكی بە پیٚغەمبەران كردبیٚ ، هەمان فەرمانیشی بە باوەرداران كردووە ،** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ [المُؤۡمِنُون : ٥١] ، **واتە: ئەی پیٚغەمبەر بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك ، كارو كردەوەی باش بكەن ، بەراستی من بەوەی ئیٚوە دەیكەن ئاگادارم ، هەروەها دەفەرموویٚت :** قال تعالى: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقۡنَـٰكُمۡ﴾ [البَقَرَة : ١٧٢] ، **واتە: ئەی ئەوانە باوەرتان هیٚناوە ، بخۆن لە خواردەمەنی حەلال و پاك كە ئیٚمە كردومانن بە رزق و رۆزی ئیٚوە ، ئینجا پیٚغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاویٚكی كرد دەچیٚ بۆ سەفەری دوور و دریٚژ قژی گڤ دەبیٚ تیٚك دە ئالیٚ ،وە چلك تەپ و تۆزی لیٚ دەنیشیٚ دەستی بەرز دەكاتەوە بۆ ئاسمان و دەپاریٚتەوە دەلیٚت : ئەی پەروەردگارم ، خواردن و خواردنەوەی حەرامە ، پۆشاكی حەرامە ، بەحەرام گۆشكراوە ، دەی ئیتر پارنەوەی چۆن لیٚ وەردەگیریٚ یان ئیتر چۆن وەلامی پارانەوەكەی دەدریٚتەوە ..؟!**

[٥٣] - السنن الترمذي برقم ( ٢٩٨٩ )

## هەژدەم : پێویستە لەگەڵ خۆیدا دوعاو پارانەوە بکات بۆ دایك و باوکی :

قال تعالی: ﴿وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ۝٢٤﴾ [الإِسۡرَاء : ٢٤] واتە : [ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ ] وە باڵی زەلیلیان بۆ شۆڕ بکەوەو بەڕەحم و سۆزو بەزەیی و خۆبەکەمزانبە لەگەڵیاندا [ وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا ] وە دوعایان بۆ بکە بڵێ: ئەی پەروەردگار ڕەحمیان پێ بکە [ كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا (٢٤) ] هەروەکو چۆن ئەوان بە منداڵی و بە بچووکی منیان پەروەردە کردووە..؟!

قال تعالی: ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ۝٤١﴾ [إِبۡرَاهِيم : ٤١]واتە : [ رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ ] ئەی پەروەردگار لە خۆم و دایك و باوکم خۆشبە، (کاتێك ئەم دوعایەی کرد نەیزانی باوکی لەسەر کوفر ئەمرێت) [ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ (٤١) ] وە لە باوەڕداران خۆشبە لەو ڕۆژەی کە خەڵکی هەڵئەستنەوە بۆ لێپرسینەوە لە ساحەی مەحشەردا..؟!

## نۆزدەم : پێویستە بۆ ئیماندارانیش لە نێرو مێ دوعا و پارانەوە بکەین :

قال تعالی: ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ۝١٩﴾ [مُحَمَّد : ١٩] واتە : [ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ] ئەی محمد - صلی الله علیه وسلم - زانیاریت هەبێ و بزانە بەوەی کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی پیرۆزی (اللَّه) نەبێ وە بەردەوام بە لەسەر ئەمە [ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ] (عبداللە¬ی کوڕی سەرجس) دەفەرمێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - خواردنی دەخوارد منیش لەگەڵیدا خواردم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - خوای گەورە لێت خۆش بێت، فەرمووی: (لە تۆیش خۆش بێت)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - داوای لێخۆش بوونت بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ، بۆ خۆیشتان داوا بکەن) وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: وە داوای لێخۆشبوون بکە بۆ تاوانەکانی خۆت و بۆ باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت، کە ئەمیش وروژاندن و هاندانە بۆ ئەوەی کە باوەڕداران داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن، وە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - دەفەرمێت: (ئەی خەڵکینە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکەن، من لە ڕۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەم و بۆ لای دەگەڕێمەوە) [ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ (١٩) ] وە خوای گەورە زانیاری هەیە بەو کردەوانەی کە ئێوە لە دونیادا ئەیکەن یان لە قیامەت، یاخود بە ڕۆژ ئەیکەن یاخود بە شەو، یاخود لە شوێنی خۆتان دەیکەن یان لە سەفەردا..؟!

## بیستەم : تەنها لە داوا لە (خوای گەورە) بکەین لە پارانەوەدا :

**لە (عبداللە کوری عباس )– رەحمەتی خوای لێ بێت – دەلێت : ئێمە لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین ، فەرمووی :**

((يا غُلامُ إنِّي أعلِّمُكَ كلِماتٍ، احفَظِ اللَّهَ يحفَظكَ ، احفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تجاهَكَ ، إذا سأَلتَ فاسألِ اللَّهَ، وإذا استعَنتَ فاستَعِن باللَّهِ، واعلَم أنَّ الأمَّةَ لو اجتَمعت علَى أن ينفَعوكَ بشَيءٍ لم يَنفعوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ لَكَ، ولو اجتَمَعوا على أن يضرُّوكَ بشَيءٍ لم يَضرُّوكَ إلَّا بشيءٍ قد كتبَهُ اللَّهُ عليكَ، رُفِعَتِ الأقلامُ وجفَّتِ الصُّحفُ )) .[٥٤]

**واتە: ئەی لاو یان گەنج من چەند ووشەیەکت فێر دەکەم : سنووری (خوای گەورە ) بپارێزە (خوای گەورە ) دەتپارێزێت ، سنووری (خوای گەورە ) بپارێزە لە بەرەدەمت یان لە بەرەو رووتدا دەیبینیت دێت بە هاناتەوە ، ئەگەر پارایتەوە تەنها لە (خوای گەورە ) دوا بکە ، وە ئەگەر پشتت بەست تەنها بە (خوای گەورە) ببەستە ، وە چاك بزانە ئەگەر هەموو خەلکی کۆببنەوە تا سودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ سودێکت پێ بگەیەنن جگە لەوەی کە (خوای گەورە) بۆی نووسیویت ، وە ئەگەر کۆببنەوە لە سەر ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن هیچ زیانێکت لێ نادەن جگە لەوەی کە (خوای گەورە) لەسەری نووسیویت ، قەلەم هەلگیراوە و پەراویش ووشك بۆتەوە ..؟!**

٥٤- سنن الترمذي برقم (٢٥١٦).

# دەربارەی ئەو کاتانەی دوعاو پارانەوە تێدا گیرا دەبێت:

**یەکەم : (ليلة القدر ) لە کاتی شەوی قەدر :**

قال تعالى: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ٥﴾ [القَدۡر : ١ - ٥] واتە : سوورەتی (قەدر) (واتە: پلەو پایە بەرز یان تەقدیر کردن) سوورەتێکی مەککی یەو (٥) ئایەتە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ دابەزینی قورئان لە شەوی قەدر [ إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ (١) ] ئێمە ئەو قورئانە پیرۆزەمان دابەزاندۆتە خوارەوە لە شەوی قەدردا، کە دەکەوێتە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانەوە، وە لە شەوە تاکەکاندا زیاتر جەختی لێکراوەو فەرموودەی زۆری لەسەر هاتووەو صەحابەکان قسەیان لەسەر کردووە، لەم شەوەدا خوای گەورە قورئانی پیرۆزی هەر هەمووی لە (لوح المحفوظ)هوە دابەزاندووە بۆ (بيت العزة) بۆ ئاسمانی دونیا پاشان بە بەش بەش و پارچە پارچەو ئایەت ئایەت و سوورەت سوورەت بەگوێرەی ڕووداوەکان و پێویستی لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا دابەزیوە بۆ سەر سینگی پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - ، وە بۆیە پێی ئەووترێ: (لَيْلَةِ الْقَدْرِ) لەبەر ئەوەی لەو شەوەدا خوای گەورە تەقدیری هەموو شتێك ئەکات تا ساڵی داهاتوو، یاخود وتراوە: مەبەست پێی شەوێکی خاوەن پلەو پایەو ڕێزو گەورەییە..؟!بۆیە خوای گەورەش ئەفەرمووێ: [ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ (٢) ] ئەی محمد - صلى الله عليه وسلم - تۆ چوزانی ئەم شەوی قەدرە چ شەوێکی پیرۆزو گەورەو پڕ خێرو بەرەکەتە..؟! {فەزل و گەورەیی شەوی قەدر} [ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣) ] ئەم شەوی قەدرە عیبادەت کردن و خواپەرستی تێیدا ئەجرو پاداشتی زیاترە لە هەزار مانگ، لەبەر ئەوەی ئوممەتانی پێشتر تەمەنیان درێژ بووەو عیبادەتی خوای گەورەیان زیاتر کردووە خوای گەورە ڕێزی لەم ئوممەتە ناوە بەوەی کە لەو شەوەدا هەر کەسێك عیبادەت و خواپەرستی بکات بۆ خوای گەورە ئەو شەوی قەدرە خێری زیاترە لە هەزار مانگ جگە لە شەوی قەدر تیایدا، واتە: هەزار مانگەکە شەوی قەدری تیادا نەبێ تەنها شەوی قەدر خێری هەزار مانگی زیاتری هەیە کەسێك عیبادەتی خوای گەورە بکات، بەڵام بە مەرجێك عیبادەت بێت وەکو دوعاو پاڕانەوەو نوێژو قورئان خوێندن و زیکری خوای گەورە، نەك بە شتی دونیایی کاتەکە بەسەر ببرێت و چاوەڕێ بیت کە خێری زیاتر لە هەزار مانگت دەست بکەوێ، ئەوە هەڵەیە..؟! [ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا ]...



لەو شەوەدا مەلائیکەت دائەبەزن وەکو پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - ئەفەرمووێ: (ژمارەی ئەو مەلائیکەتانەی کە لەو شەوەدا دائەبەزن زیاترە لە ژمارەی وردە بەردەکان) وردە بەردو وردە زیخی دونیا چەندێك زۆرە ژمارەی ئەو مەلائیکەتانەی لەو شەوەدا دائەبەزن لەوە زیاترە، واتە: مەلائیکەتێکی یەکجار زۆر دائەبەزێتە سەر ڕووی زەوی کە خێرو بەرەکەتیان پێیە، وە ڕوحیش دائەبەزێ کە مەبەست پێی جبریلە یاخود ئەو تەفسیرانەی تر کە لە سوورەتی (نەبەئدا) بۆیمان کرد [ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ] بە فەرمانی خوای گەورە [ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ (٤) ] بە هەموو فەرمانێك لەلایەن خوای گەورەوە دائەبەزن..؟! {نیشانەکانی شەوی قەدر} [ سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ (٥) ] ئەو شەوە سەلامەت و هێمن و ئارامەو شەیتانەکان ناتوانن هیچ خراپەیەکی تیادا ئەنجام بدەن، یان ئازاری هیچ کەسێك بدەن، یاخود وتراوە: مەلائیکەتەکان لە شەوی قەدردا سڵاو لە ئەهلی مزگەوتەکان ئەکەن تا دەرکەوتنی فەجرو بانگی بەیانی، نیشانەی شەوی قەدریش ئەوەی کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - باسی کردووە شەوێکی سافە نە ساردەو نە گەرمە، وە لەو شەوەدا هیچ نەیزەکێك تێناگیرێت تا بەیانی، وە خۆریش کە بەیانییەکەی هەڵدێ سوورو لاوازە وەکو مانگ وایە هیچ تیشکێکی نیە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە شەوی قەدرە، پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - ویستی شەوی قەدر دیاری بکات و پێیان بڵێ بەڵام دوو کەس کێشەو ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - بە ئیزنی خوای گەورە لەبیری کرد، حیکمەتەکەش ئەوەیە کە تۆ هەموو ئەو دە شەوە دابنیشی وەکو پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - خۆی ئەو دە شەوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەمەیاوە، بەڵکو ئیعتیکافی ئەکردو ئەم دە شەو و دە ڕۆژە لە مزگەوتدا ئەمایەوەو نەئەهاتە دەرەوەو عیبادەتی خوای گەورەی ئەکرد، وە سوننەتیشە لەو شەوەدا ئەم دوعایە زۆر بکەی: (اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفْوٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) وەکو عائیشە پرسیاری لە پێغەمبەر کرد - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی: ئەم دوعایە زۆر بکە: خوایە تۆ عەفو و لێبووردەی و لێبووردەیت خۆش ئەوێ خوایە لێمان ببوورە خوایە لێمان خۆش ببە، والله أعلم.



**دووەم : لە کاتی هەموو نوێژە فەرزەکان :**

لە (ابو أمامة الباهلي ) – **خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت** : ((قيل يا رسولَ اللهِ! أيُّ الدعاءِ أسمعُ؟ قال جوفُ الليلِ الآخرِ ودبرُ الصلواتِ المكتوباتِ)) . [٥٥] **واتە : ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام دوعاو پارانەوەیە قبول دەبێت ، یان گیرا دەبێت ..؟! فەرمووی: دوعاو پارانەوەی کاتی کۆتایی شەو ، وە دوای هەموو نوێژە فەرزەکان ..؟!**

**سێ یەم : لە کاتی کۆتا بەشی شەودا :**

**لە (عمرو کوری عبسە ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : گویٚم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی :** ((أقربُ ما يكونُ الربُّ من العبدِ في جوفِ الليلِ الآخرِ فإنِ استطعْتَ أن تكونَ ممن يذكرُ اللهَ في تلْكَ الساعَةِ فكُنْ )) . [٥٦]

**واتە: نزیکترین کات کە (خوای گەورە) لە بەندە نزیکە لە کۆتایی شەودایە ، جا ئەگەر توانیت لە کەسانە بیت کە یادی (خوای گەورە) دەکەن لە و کاتەدا ئەوا ببە ..؟!**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت :** ((يَنْزِلُ رَبُّنا تَبارَكَ وتَعالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إلى السَّماءِ الدُّنْيا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ فيَقولُ: مَن يَدْعُونِي فأسْتَجِيبَ له، مَن يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَن يَسْتَغْفِرُنِي فأغْفِرَ له )) . [٥٧]

**واتە: (خوای پەروەردگار ) مان هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا لە کاتی سێ بەشی کۆتایی شەو ماوە ، وە دەفەرمووێت : کیٚ لێم دەپارێتەوە با وەلامی بەدەمەوە ، وە کیٚ داوام لیٚ دەکات با پێی ببەخشم ، کیٚ داوای لیٚ خۆشبوونم لیٚ دەکات تا لێی خۆشبم ..؟!**

**لە (عثمان بن ابي العاص ) – خوا لیٚ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((تُفْتَحُ أبوابُ السَّماءِ نِصْفَ اللَّيلِ، فيُنادي مُنادٍ: هلْ مِن داعٍ فيُسْتجابَ له؟ هلْ مِن سائلٍ فيُعْطى؟ هلْ مِن مَكروبٍ فيُفرَّجَ عنه؟ فلا يَبْقى مُسلِمٌ يَدْعو بدَعوةٍ إلَّا استجابَ اللهُ عَزَّ وجَلَّ له، إلَّا زانيةً تَبْغي بفَرْجِها، أو عشَّارًا )) . [٥٨] **واتە: لە کاتی نیوەی شەودا دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە ،کەس هەیە داوا بکات و دەفەرمووێت : بپارێتەوە هەتا وەلام بدرێتەوە ..؟! کەس هەیە داوا بکات هەتا پێی ببەخشرێت ..؟! کەسێکی پیٚ قبول کراو هەیە هەتا دەرووی لیٚ بکرێتەوە ..؟! جا هیچ موسلمانێك نامێنێت کە بپارێتەوە بە داواکاری یەك ئیلا (خوای گەورە) وەلامی دەداتەوە ، جگە لە ئافرتێکی زیناکار یان کەسێك کە مال و سامانی خەلك بە زۆر داگیر دەکات و دەیخوات ..؟!**

---

[٥٥] - سنن الترمذي برقم ( ٣٤٩٩ ).
[٥٦] -سنن الترمذي برقم (٣٥٧٩).
[٥٧] - صحيح البخاري برقم (٧٤٩٤).
[٥٨] - اخرجه الطبراني في المعجم الاوسط (١٥٤/٣).

**چوارەم : لە نێوان بانگ و قامەتدا :**

**لە (ئەنس کوری مالك ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

((الدعاءُ لا يُردُّ بين الأذانِ والإقامةِ)) [٥٩] واتە: لە دوعاو پارانەوە لەکاتی بانگ و قامەتدا رەت نابێتەوە ..؟!

**پێنچەم : لە کاتی بانگدان بۆ پێنچ نوێژە فەرزەکە :**

**لە (سهل کوری سعد ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

((ثِنتانِ لا تَردَّانِ أو قلَّما تَردَّانِ الدُّعاءُ عِندَ النِّداءِ وعِندَ البَأسِ حينَ يَلحَمُ بَعضُهُم بَعضًا)) .[٦٠] واتە: دوعاو پارانەوە لە دوو کاتدا رەت ناکرێتەوە یان زۆر بەکەمی رەت دەبێتەوە ، پارانەوەی لە کاتی بانگ ، وە لە کاتی نارەحەتی نەهامەتی ، تێکرژانی سوپاکان ..؟!

**شەشەم : لەکاتی قامەت کردن ، وە لەکاتی رێز بوون بۆ جیهاد و تیٚ کۆشان لە پێناوی (خوای گەورە)**

**لە (سهل کوری سعد ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

((ساعتانِ لا تُرَدُّ على داعٍ دعوتُه حينَ تُقامُ الصَّلاةُ وفي الصَّفِّ في سبيلِ اللهِ )) .[٦١] واتە: لە دوو کاتدا دوعاو پارانەوەی کەسی دوعاکار رەت نابێتەوە ، یەکەم : لە کاتی قامەتی نوێژ کردن ، وە لەکاتی رێز بوون لە جیهادو تیٚ کۆشاندا لە پێناوی (خوای گەورە)..؟!

**حەوتەم : لە کاتی باران بارین لە بەر باراندا :**

**لە (سهل کوری سعد ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

((ثِنْتانِ لا تُرَدَّانِ أو قلَّما تُرَدَّانِ؛ الدُّعاءُ عند النِّداءِ، وعند البأسِ حينَ يَلْحَمُ بعضُهم بعضًا، وفي زيادةٍ: ووقت المَطَرِ)) [٦٢]

واتە: دوعاو پارانەوە لە دوو کاتدا رەت ناکرێتەوە یان زۆر بەکەمی رەت دەبێتەوە ، پارانەوەی لە کاتی بانگ ، وە لە کاتی نارەحەتی نەهامەتی ، تێکرژانی سوپاکان یان لە کاتی باران بارین دا ..؟!

---

[٥٩] -سنن الترمذي برقم (٢١٢).
[٦٠] -وابن خزيمة برقم (٤١٩).
[٦١] - سنن ابو داود برقم ( ٢٥٤٠) ، الدارمي برقم (١٢٠٠).
[٦٢] -سنن ابو داود برقم (٢٥٤٠).

**هەشتەم : لەکاتی هێرش بردن و تێکرژانی ریزەکان لە پێناوی (خوای گەورە) :**

**لە (سهل کوری سعد ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی**

((ثِنتانِ لا تَردَّانِ أو قلَّما تَردَّانِ الدُّعاءُ عِندَ النِّداءِ وعِندَ البَأسِ حينَ يَلحَمُ بَعضُهُم بَعضًا)) .[٦٣] واتە: دوعاو پارانەوە لە دوو کاتدا رەت ناکرێتەوە یان زۆر بەکەمی رەت دەبێتەوە ، پارانەوەی لە کاتی بانگ ، وە لە کاتی نارەحەتی نەهامەتی ، تێکرژانی سوپاکان ..؟!

**نۆیەم : لە کاتێك لەهەموو شەوێکدا :**

**لە (جابر کوری عبدالله ) – خوا لیّ رازی بێت – دەلێت : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی:** ((سَمِعْتُ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ يقولُ: إنَّ في اللَّيْلِ لَسَاعَةً لا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ، يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِن أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، إلَّا أَعْطَاهُ إيَّاهُ، وَذلكَ كُلَّ لَيْلَةٍ )).[٦٤] واتە: لە کاتی شەودا کاتێك هەیە کە هیچ پیاوێکی موسلمان نیە کە هاوگیری ئەو کاتە بکات و تیایدا بۆ کاری خێری دونیاو قیامەت لە (خوای گەورە ) بپارێتەوە ، ئیلا پێی دەبە خشرێت ئەمەش لە هەموو شەوێکدایە ..؟!

**دەیەم : کاتێك لە کاتەکانی رۆژی هەینی :**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت " لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((إنَّ في الجُمُعَةِ لَساعَةً، لا يُوافِقُها مُسْلِمٌ، قائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا، إلَّا أعْطاهُ إيَّاهُ. وَقالَ بيَدِهِ: يُقَلِّلُها يُزَهِّدُها )) .[٦٥]
واتە: بەراستی لە رۆژی هەینی دا کاتێك هەیە ، ئەگەر موسلمان رێکەوتی بکات یان هاو گیری بکات بە پێوە نوێژ بکات وە لە (خوای گەورە) بپارێتەوە بۆ هەر شتێکی خێر ، ئیلا پێی دەبەخشێت ، وە بە پەنجەی دەست ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە کاتەکەی کورت و کەمە ..؟!

---

[٦٣]-وابن خزيمة برقم (٤١٩).
[٦٤]-صحيح مسلم برقم (٧٥٧).
[٦٥]- صحيح مسلم برقم (٨٥٢).

**یانزەم : لە کاتی خواردنەوەی ئاوی (زمزم ) لەگەل نیەتی پاکدا :**

**لە (جابر کوری عبدالله ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت :لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((ماءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ له)) .[٦٦] واتە: ئاوی زمزم بۆ ئەو مەبەستەیە کە بۆی دەخورێتەوە ..؟!

**دوانزەم : لە کاتی (سووجدە )بردن دا :**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت " لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((أَقْرَبُ ما يَكونُ العَبْدُ مِن رَبِّهِ، وهو ساجِدٌ، فأكْثِرُوا الدُّعا )) .[٦٧] واتە: نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری یەوە ئەو کاتەیە کە لە (سووجدە ) دایە ، دەسا زۆر دوعاو پارانەوەی تێدا ئەنجام بدەن ..؟!

**سیانزەم : لە کاتی هەلسان لە نێوە شەودا یان لە شەودا دوعاو پارانەوە بەکاتی دیاری کراوی ئەو کاتە :**

**لە (عبادة بن الصامت )– خوا لیٚ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((مَن تَعارَّ مِنَ اللَّيْلِ، فَقالَ: (لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لا شَرِيكَ له، له المُلْكُ وله الحَمْدُ، وهو علَى كُلِّ شيءٍ قَدِيرٌ ، الحَمْدُ لِلَّهِ، وسُبْحَانَ اللَّهِ، ولَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، واللَّهُ أكْبَرُ، ولَا حَوْلَ ولَا قُوَّةَ إلَّا باللَّهِ) ثُمَّ قالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، أوْ دَعَا؛ اسْتُجِيبَ له، فإنْ تَوَضَّأَ وصَلَّى قُبِلَتْ صَلَاتُهُ )).[٦٨]

واتە: هەر کەسێك لە شەودا هەلسایەوە ووتی : (لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لا شَرِيكَ له، له المُلْكُ وله الحَمْدُ، وهو علَى كُلِّ شيءٍ قَدِيرٌ ، الحَمْدُ لِلَّهِ، وسُبْحَانَ اللَّهِ، ولَا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، واللَّهُ أكْبَرُ، ولَا حَوْلَ ولَا قُوَّةَ إلَّا باللَّهِ) پاشان بلیٚ : (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ) خوایە لێم خۆشبە ، یان پارایەوە ئەوا وەلام دەدرێتەوە ، خۆ ئەگەر دەستنوێژی شت و نوێژی کرد ئەوا نوێژەکەی وەر دەگیرێت ..؟!

---

[٦٦] -سنن ابن ماجه برقم (٣٠٦٢).

[٦٧] -صحيح مسلم برقم (٤٨٢).

[٦٨] - صحيح البخاري برقم (١١٥٤).

**چواردەم : دوعا كردن لەكاتی هاتنی بەلاو نصیبەت و نەهامەتی دا :**

**لە ( ام سلمه دایكی ئیماندااران ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەگیٚریتەوە دەلیٚت : لە پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((سَمِعْتُ رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ يقولُ: ما مِن عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فيَقولُ: {إنَّا لِلَّهِ وإنَّا إلَيْهِ رَاجِعُونَ} [البقرة:١٥٦]، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي في مُصِيبَتِي، وَأَخْلِفْ لي خَيْرًا منها، إلَّا أَجَرَهُ اللَّهُ في مُصِيبَتِهِ، وَأَخْلَفَ له خَيْرًا منها. قالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلتُ: كما أَمَرَنِي رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ، فأخْلَفَ اللَّهُ لي خَيْرًا منه، رَسولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وَسَلَّمَ )) .[٦٩]

واتە: هیچ موسلمانیٚك نیە كە نصیبەتیٚكی بەسەر بیٚت یان تووش بیٚت و هەر وەك (خوای گەورە ) فەرمانی پیٚ كردووە بلیٚت : {إنَّا لِلَّهِ وإنَّا إلَيْهِ رَاجِعُونَ} ئیلا (خوای گەورە ) كەسیٚكی باشتری بۆ دەخاتەوە شویٚنی ..؟!

**پانزەم : دوعاو پارانەوە لەكاتی دەست پیٚ كردنی بەم دوعایەنویٚژ :**

**( الله أكبر كبيرا ، والحمد الله كثيرا ، وسبحان الله بكرة وأصيلا )**

**لە (عبد الله كوری عمر ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت :** ((بينَما نحنُ نصلِّي معَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ إذ قالَ رجلٌ منَ القومِ: اللَّهُ أَكْبرُ كبيرًا، والحمدُ للَّهِ كثيرًا، وسُبحانَ اللَّهِ بُكْرةً وأصيلًا ، قالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: مَنَ القائلُ كذا وَكَذا ؟ فقالَ رجلٌ منَ القومِ: أَنا، يا رسولَ اللَّهِ قالَ: عَجِبْتُ لَها، فُتِحَت لَها أبوابُ السَّماءِ قالَ ابنُ عمرَ: ما ترَكْتُهُنَّ منذُ سَمِعْتُ مِن رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ )) .[٧٠] واتە: جاریٚ لەگەل پیٚغەمبەری خوا ﷺ نویٚژمان دەكرد ، یەكیٚ لە ئامادەبووان ووتی : **( الله أكبر كبيرا ، والحمد الله كثيرا ، وسبحان الله بكرة وأصيلا )** واتە: خوا لە هەموو شتیٚك گەورەترە ، سوپاس و ستایشیٚكی زۆر بۆ (خوای گەورە) ، پاكی و بیٚگەردی بۆ خوا هەردەم بە بەیانیان و ئیٚواراندا ، پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەوە كیٚ بوو ئاواو ئاوای ووت ..؟! پیاوەكە ووتی : ئەی پیٚغەمبەری خوا ﷺ من بووم ..!! ئەویش فەرمووی : سەیرە سەرجەم دەرگاكانی بەهەشتی بۆ كرایەوە ، (ابن عمر ) خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : لە پاش ئەوەی بیستم لە پیٚغەمبەری خوا ﷺ ئیٚتر وازەم لیٚ نەهیٚناوە یان تەركم نەكردووە ..؟!

---

[٦٩] - صحيح مسلم برقم (٩١٨).
[٧٠] - سنن الترمذي برقم (٣٥٩٢).

**شانزەم : دوعاو پارانەە لەکاتی دەست پێ کردنی بەم دوعایە نوێژ:**

**(الحمد لله حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه )**

له ( رفاعة بن رافع )– خوا لێ رازی بێت – دەلێت : ((صلَّيتُ خلْفَ رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم فعطِسْتُ فقلتُ الحمدُ للهِ حمدًا كثيرًا طيِّبًا مُبارَكًا فيه مُباركًا عليه كما يُحِبُّ ربُّنا ويرْضى فلمَّا صلَّى رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ انْصرفَ فقال منِ المُتكلِّمُ في الصلاةِ. فلم يتكلَّم أحدٌ، ثم قالَها الثانيةَ : منِ المُتكلِّمُ في الصلاةِ. فلم يتكلَّم أحدٌ، ثم قالها الثالثةُ : منِ المُتكلِّمُ في الصلاةِ. فقال رِفاعةُ بنُ رافِعِ ابنِ عَفْراءَ : أنَا يا رسولَ اللهِ قال : كيف قُلتَ ؟ قال قُلتُ : (الحمدُ للهِ حمدًا كثيرًا طيِّبًا مُباركًا فيهِ)، مُباركًا عليهِ كما يُحِبُّ ربُّنا ويرْضى. فقال النبيُّ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ ( والَّذي نفْسِي بيدِهِ، لقد ابْتَدَرَها بِضعةٌ وثلاثونَ مَلَكًا أيُّهم يَصْعدُ بِها )). [٧١] واتە:

جارێ لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم دەکرد پژمیم ووتم: (الحمدُ للهِ حمدًا كثيرًا طيِّبًا مُباركًا فيهِ) واتە: ئەی پەروەردگارا سوپاس و ستایش هە شاسیتەی تۆیە ، سوپاسێکی زۆری پاکی پیرۆزبێ ، پیرۆزبێ لەسەر بەو شێوەیەی کە (خوای گەورە ) پێی خۆشەو پێی رازییە ، کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە فەرمووی : کێ بوو لە نوێژدا ئەو قسەیە کرد ..؟! کەس قسەی نەکرد ، بۆ جاری سێیەم فەرمووی : کێ بوو لە نوێژدا ئەو قسەیەی کرد .؟! (رفاعە کوری رافع ) ووتی : من بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش فەرمووی : چیت ووت ..؟! فەرمووی : (الحمدُ للهِ حمدًا كثيرًا طيِّبًا مُباركًا فيهِ)، مُباركًا عليهِ كما يُحِبُّ ربُّنا ويرْضى) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموووی : سوێند بە اللە سی و ئەوەندە مەلائیکە پێشبرکێیان بوو کە کامیان بەرزی بکەنەوە ..!!

[٧١] سنن الترمذي برقم (٤٠٤).

**حەڤدەم : لە دوعا كردنی لە كاتی سەر بەرز كردنەوە لە ركوع دا :**

**(ربنا ولك حمدا كيثرا طيبا مباركا فيه )**

**لە ( رفاعة بن رافع )– خوا لیّ رازی بیّت – دەلیّت :** ((كنا يوما نصلي وراء رسول اللهِ صلى الله عليه وسلم فلما رفع رسول اللهِ صلى الله عليه وسلم رأسه من الركوع قال (سمع الله لمن حمده) قال رجل وراء رسول اللهِ صلى الله عليه وسلم( اللهم ربنا ولك الحمد حمدا كثيرا طيبًا مبًاركا فيه ) فلما انصرف رسول اللهِ صلى الله عليه وسلم قال من المتكلم بها آنفا فقال الرجل أنا يا رسول اللهِ فقال رسول اللهِ صلى الله عليه وسلم لقد رأيت بضعة وثلاثين ملكا يبتدرونها أيهم يكتبها أول)).[٧٢]

واتە : جاریّ لە دوای پیّغەمبەری خوا ﷺ نویّژمان دەكرد ، پیّغەمبەر ﷺ كاتیّ سەری بەرز كردەوە لە ركوع فەرمووی : (سمع الله لمن حمده) واتە: (خوای گەورە ) بیسەر و سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەكەن ، پیاویّك لە دوای پیّغەمبەری خوا ﷺ ووتی : ( اللهم ربنا ولك الحمد حمدا كثيرا طيبًا مبًاركا فيه ) واتە: خوایە !! ئەی پەروەردگارا سوپاس و ستایش هەر شایستەی تۆیە ، سوپاسیّكی زۆری پاكی پیرۆزیی ، كاتیّ پیّغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە فەرمووی : كیّ بوو ئیّستا ئەم ووتانەی خویّند ..؟! پیاویّك ووتی : من ئەی پیّغەمبەری خوا ﷺ ، پیّغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بیّ گومان بینیم سی و ئەوەندە مەلائیكە پیّشبركیّیان بوو كە كامیان یەكەم كەس بینووسیّت ..؟!

---

[٧٢] - سنن ابو داود برقم (٧٧٠).

**هەژدەم : لە کاتی ووتنی (ئامین ) لە نوێژ دا :**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :**

((إذا أمَّنَ الإمامُ فأمِّنُوا، فإنَّه مَن وافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ المَلائِكَةِ، غُفِرَ له ما تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِهِ قالَ ابنُ شِهابٍ كانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يقولُ: آمِينَ )) . [٧٣] واتە: ئەگەر ئیمام ئامینی کرد ئێوەش بیکەن ، هەر کامتان ئامینەکەی لەگەل ئامینی مەلائیکەت یەك بگرێت ، (خوای گەورە ) لە گوناهو تاوانی رابردووی خۆش دەبێت ، (ابن شهاب ) دەلیٚ : پێغەمبەری خوا ﷺ ئامینی کرد ..؟!

**نۆزدەم : صەلاوات دان لە سەر پێغەمبەری خوا لە تەحییاتی کۆتایی دا :**

لە (فضالة بن عبيد ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : ((سمعَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ رجلًا يَدعو في صلاةٍ لم يَحمَدِ اللَّهَ ولم يُصلِّ علَى النَّبيِّ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: عجِلتَ أيُّها المصلِّي، ثمَّ علَّمَهُم رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ، وسمعَ رجلًا يصلِّي على النَّبيِّ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: أيُّها المصلِّي ادعُ تُجَبْ، وسَل تُعطَ )) . [٧٤] واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو لە نێو نوێژ دەپارایەوە نە ستایشی خوای کرد نە صەلاواتی دا لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : پە لەت کرد ئەی نوێژ خوێن ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردن ، وە گوێی لە پیاوێك بوو صەلاواتی لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی نوێژ خوێن بپارێرەوە وەلامت دەدرێتەوە داواش بکە پێت دەدرێت ..؟!

---

[٧٣] - صحيح مسلم برقم (٤١٠).
[٧٤] - ابن خزيمة برقم(٧٠٣).

**بیستەم : لە کاتیٚ پیٚش سلاو دانەوە لە نویٚژدا ووتنی ئەم دوعاو پارانەوەیە:**

**اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ يا اللَّهُ بأنَّكَ الواحدُ الأحدُ الصَّمدُ، الَّذي لم يَلِدْ ولم يولَدْ ولم يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أحَدٌ، أن تغفِرَ لي ذُنوبي، إنَّكَ أنتَ الغفورُ الرَّحيمُ**

**لە (محجن بن الادرع ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت :** ((أنَّ رسولَ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ دخلَ المسجدَ، إذا رجلٌ قد قَضى صلاتَهُ وَهوَ يتشَهَّدُ، فقالَ: اللَّهمَّ إنِّي أسأَلُكَ يا اللَّهُ بأنَّكَ الواحدُ الأحدُ الصَّمدُ، الَّذي لم يَلِدْ ولم يولَدْ ولم يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أحَدٌ، أن تغفِرَ لي ذُنوبي، إنَّكَ أنتَ الغفورُ الرَّحيمُ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ: قَد غَفرَ اللَّهُ لَهُ، ثلاثًا )) .[٧٥]

واتە: پیٚغەمبەری خوا ﷺ هاتە ناو مەزگەوتەوە ، پیاویٚك نویٚژەکەی تەواو کردبوو لە تەحیاتدا بوو ، ئەم دوعایەی خویٚند ووتی : (اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ يا اللَّهُ بأنَّكَ الواحدُ الأحدُ الصَّمدُ، الَّذي لم يَلِدْ ولم يولَدْ ولم يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أحَدٌ، أن تغفِرَ لي ذُنوبي، إنَّكَ أنتَ الغفورُ الرَّحيمُ ) واتە: خوایە من داوات لیٚ دەکەم بەوەی تاك و تەنهاو بیٌ نیازیت ، ئەو خوایەی نە لە کەس بوویت و کە لە هاو ویٚنەو هاو تای تۆ نیە ، داوات لیٚدەکەم لە گوناهەکانم خۆش ببیت ، بەراستی تۆ بە بەزەیی و میهرەبانی ..!! پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیٚ گومان خوا لیٚی خۆش بوو ، سیٚ جار ئەمەی دووبارەی کردەوە ..؟!

[٧٥] سنن النسائي برقم (١٣٠٠).

**بیست یەك : لە كاتی ووتنی ئەو دوعاو پارانەوەیە دا :**

**اللهم إني أسألك بأن لك الحمد ، لا إله إلا أنت المنان بديع السماوات والأرض ، يا ذا الجلال والإكرام ، ياحي ياقيوم**

**لە (ئەنس كوری مالك ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەگیٚریٚتەوە دەلیٚت :** ((أنَّهُ كانَ معَ رسولِ اللَّهِ صلّى اللَّهُ عليه وسلم جالسًا ورجلٌ يصلِّي ثمَّ دعا (اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّ لَكَ الحمدُ لا إلَهَ إلَّا أنتَ المنَّانُ بديعُ السَّمواتِ والأرضِ يا ذا الجلالِ والإكرامِ يا حيُّ يا قيُّومُ فقالَ) النَّبيُّ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وسلَّمَ لقد دعا اللَّهَ باسمِهِ العظيمِ الَّذي إذا دعيَ بِهِ أجابَ وإذا سئلَ بِهِ أعطى )) .[٧٦] **واتە: لە خزمەت پیٚغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین ، پیاویٚك نویٚژی دەكرد ، لە پاشدا پارایەوە دەیووت :** (اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّ لَكَ الحمدُ لا إلَهَ إلَّا أنتَ المنَّانُ بديعُ السَّمواتِ والأرضِ يا ذا الجلالِ والإكرامِ يا حيُّ يا قيُّومُ فقالَ) **واتە: خودایە من داوات لیٚ دەكەم سوپاسو ستایش هە بۆ تۆیە ، هیچ خودایەكی تر نیە جگە لە تۆ بە خشندەو خاوەن چاكەی ، دروستكەری ئاسمانەكان و زەویت ئەی گەورەی خاوەن شكۆ خاوەن ریٚز ، ئەی زیندووی نەمر ..!! پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بە ناوە گەورەكەی خوا پارایەوە ، كە هەر كەسیٚ بەم ناوەوە لیٚی بپاریٚتەوە نائومیٚدی ناكات و پارانەوەكەی گیرا دەكات ، هەر كەسیٚ ئەو ناوەوە داوای لیٚ بكات ئەیدریٚتیٚ ..؟!**

٧٦ - سنن الترمذي برقم (٣٥٤٤).

**بیست و دوو : لە کاتی ووتنی ئەم دوعاو پارانەوەدا :**

**اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله ، لا إله إلا أنت الأحد الصمد لذي لم يلد ولم يولد ، ولم يكن لة كفوا أحد**

**لە (بريدة الحصيب الأسلمي ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێڕێتەوە دەلێت :** ((سمعَ النَّبيُّ صلَّى اللَّه عليهِ وسلَّمَ رجلًا يقولُ : اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّكَ أنتَ اللَّهُ الأحدُ الصَّمدُ ، الَّذي لم يلِد ولم يولَدْ، ولم يَكُن لَهُ كُفُوًا أحدٌ، فقالَ رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّه عليهِ وسلَّمَ : لقد سألَ اللَّهَ باسمِهِ الأعظمِ، الَّذي إذا سُئِلَ بِهِ أعطى، وإذا دُعِيَ بِهِ أجابَ )) [٧٧] . **واتە : گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەپارایەوە دەی فەرموو :** اللَّهمَّ إنِّي أسألُكَ بأنَّكَ أنتَ اللَّهُ الأحدُ الصَّمدُ ، الَّذي لم يلِد ولم يولَدْ، ولم يَكُن لَهُ كُفُوًا أحدٌ **، واتە: خودایە من داوات لێ دەکەم شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەکی تر نیە جگە لە تۆ ، تاك و تەنهایی و حێی نیازی ، ئەو خوایەی نە کەست لێ بووە نە لە کەس بوویت ، کەس لە هاو وێنەو هاوتای تۆ نیە ..! ! دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە ، دلنیابە تۆ بەو ناوە شکۆمەند و گەورەکەی خوا پارایتەوە کە هەر کەس بە ناوەوە داوای لێ بکات ئەیدرێتێ هەر کەسێ پێی بپارێتەوە نائومێدی ناکات و پارانەوەکەی گیرا دەکات ..؟!**

٧٧ - سنن الترمذي برقم (٣٤٧٥).

**بيست و سێ : لە كاتی دوایی دەست نوێژ ئەم دوعا پارانەوەیە بكەیت :**

**أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله**

**لە (عمر بن الخطاب ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :** ((ما مِنْكم من أحدٍ يَتَوضَّأُ، فيُسبغُ الوضوءَ، ثمَّ يقولُ حينَ يفرُغُ من وضوئِه : أشهدُ أن لا إلهَ إلَّا اللهُ وحدَه لا شريكَ لهُ، وأنَّ محمَّدًا عبدُه ورسولُه، إلَّا فُتِحتْ لهُ أبوابُ الجنَّةِ الثَّمانيةِ، يدخلُ مِن أيِّها شاءَ )) .[٧٨]

واتە : هەر یەكێك لە ئێوە دەست نوێژ بگرێت ، بە باشی و بە تەواوی دەست نوێژەكەی بگرێت ، ئینجا بلێت : : أشهدُ أن لا إلهَ إلَّا اللهُ وحدَه لا شريكَ لهُ، وأنَّ محمَّدًا عبدُه ورسولُه ، ئەوە هەر هەشت دەرگا كەی بە هەشتی بۆ دەكرێتەوە ، لە هەر كامیان بیەوێت دەچێتە ژوورەوە ..؟!

**بيست و چوار : دوعاو پارانە وە لە دوایی لادانی رۆژ یان خۆر لە ناوەراستی ئاسمان پێش نێوەرۆ :**

**لە (عبد الله كوری السائب ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت :** ((أن رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم كان يصلي أربعًا بعد أن تزولَ الشمسُ قبل الظهرِ, وقال : إنها ساعةٌ تُفتَحُ فيها أبوابُ السماءِ، وأُحِبُّ أن يصعدَ لي فيها عملٌ صالحٌ )) .[٧٩]

واتە:كە دەلێت پێغەمبەری خوا ﷺ ، كاتێ رۆژ یان خۆر لایدەدا بە ناوەراستی ئاسمانە چوار رەكات نوێژی سوننەتی دەكرد لە پێش چوار رەكات نوێژی فەرزی نیوەرۆدا ، دەی فەرموو : لەم كاتەدا سەرجەم دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە ، بۆیە حەز دەكەم كردەویەكی چاكی منیان لێوە سەركەوێ ..؟!

---

[٧٨]- صحيح مسلم برقم (٢٣٤).

[٧٩]-سنن الترمذي برقم (٤٧٨).

**بیست و پێنج : دوعاو پارانەوە لە مانگی رەمەزاندا :**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((إِذَا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أبْوَابُ الجَنَّةِ، وغُلِّقَتْ أبْوَابُ جَهَنَّمَ، وسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ )) .[٨٠]

**واتە: کاتێ رەمەزان هات دەرگاکانی بە هەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکانیش کۆت زنجیر دەکرێن ..؟!**

**لە (ابو هريره ) – خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((إذا كانَ رَمَضانُ فُتِّحَتْ أبْوابُ الرَّحْمَةِ، وغُلِّقَتْ أبْوابُ جَهَنَّمَ، وسُلْسِلَتِ الشَّياطِينُ)).[٨١]

**واتە: کاتێ رەمەزان هات دەرگاکانی رەحمەت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکانیش کۆت زنجیر دەکرێن ..؟!**



٨٠- صحيح البخاري برقم (٣٢٧٧).
٨١- صحيح مسلم برقم (١٠٧٩).

**بیست و شەشە : لە کاتی کۆ بوونەوەی دانیشتنەکانی کۆمەلی زیکری موسلمانان :**

**لە (ابو هریرە ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی**

((إنَّ لِلَّهِ مَلائِكَةً يَطُوفُونَ في الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أهْلَ الذِّكْرِ، فإذا وجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنادَوْا: هَلُمُّوا إلى حاجَتِكُمْ قالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بأَجْنِحَتِهِمْ إلى السَّماءِ الدُّنْيا، قالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ -وهو أعْلَمُ منهمْ- ما يَقولُ عِبادِي؟ قالوا: يَقولونَ: يُسَبِّحُونَكَ ويُكَبِّرُونَكَ، ويَحْمَدُونَكَ .... فيَقولُ: فَأُشْهِدُكُمْ أنِّي قدْ غَفَرْتُ لهمْ، قالَ: يقولُ مَلَكٌ مِنَ المَلائِكَةِ: فيهم فُلانٌ ليسَ منهمْ، إنَّما جاءَ لِحاجَةٍ، قالَ: هُمُ الجُلَساءُ لا يَشْقَى بهِمْ جَلِيسُهُمْ )) . [٨٢] واتە: (خوای گەورە) کۆمەلە مەلائیکەتێکی هەیە بە ڕێگاکاندا دەگەڕێن بە دوای ئەهلی زیکردا ، کاتی کۆمەلێکیان دۆزیەوە کە خەریکی زیکرو یادی (خوای گەورە)ن یەکتر بانگ دەکەن و دەفەرموون : وەرن ئەمە مەبەستەکەمانە ، دەفەرموویت : جا بە باڵەکانیان تا ئاسمانی دونیا دەوریان دەدەن، دەفەرموویت : (خوای پەروەردگار ) پرسیاریان لێ دەکات لە کاتێکدا ئاگادارترو زاناترە لەوان : بەندەکانم چی یان دەوێت ..؟! دەڵێن: تسبیحات و تەکبیرو حەمدو ستایشی تۆیان دەکرد ... لە کۆتایی فەرموودەکەدا هاتووە : (خوای گەورە ) دەفەرموویت : دە ئێوە بە شاهید دەگرم ئەوە من لێیان خۆش بووم ، دەفەرموویت : یەکێك لە مەلائیکەتەکان دەفەرموویت : ئەوان فلانە کەسیان تێدایەو لەوان نیە ، بەڵکو بۆ پێویستی یەکی خۆی هاتبوو ، (خوای گەورە ) دەفەرموویت : ئەوانە کەسانێکن ئەوەی هاونشین و هاوڕێیەتیان بکات بەد بەخت نابێت ..؟!

**لە ( ابو سعید الخدری و ابو هریرە ) – خوا لێیان ڕازی بێت – دەگێڕێنەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((لَا يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلَّا حَفَّتْهُمُ المَلَائِكَةُ ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عليهمِ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَن عِنْدَهُ )). [٨٣] واتە: هیچ کۆمەلە کەسێك نین کە لە شوێنێکدا دابنیشن و زیکرو یادی (خوای گەورە ) بکەن ، ئیلا مەلائیکەت دەورەیان دەدەن و ڕەحمەت یان بۆ لێدەدەن یان دەپۆشن و سەکینەو دل ئارامی دادەبەزێتە سەریان ، وە (خوای گەورە ) لە لای مەلائیکەتە پلە بەرزەکان باسایان دەکات ..؟!

---

[٨٢]- صحيح البخاري برقم (٦٤٠٨).
[٨٣]-صحيح مسلم برقم (٢٧٠٠).

**بیست و حەوت : لەکاتی خوێندنی کەلە شێر دا :**

**لە (ابو هريرە ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

((إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ؛ فإنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، وإذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا باللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ؛ فإنَّه رَأَى شيطَانًا )) . [٨٤] **واتە : کاتێ گوێتان لە خوێندنی کەلە شێر بوو ، داوای فەزلی (خوای گەورە) بکەن چونکە مەلائیکەتی بینیوە ، وە کاتێ گوێتان لە زەرەی کەر یان گوێ درێژ دەبێت پەنا بگرن بە (خوای گەورە) لە شەیتان ، چونکە شەیتانی بینیوە ..؟!**

**بیست و هەشت : لە کاتی تەنگانە و نەهامەتی روو کردنە لای (خوای گەورە ) بە تەنها و بە ئیخلاص و نیاز پاکی :**

**ئەمەش ئەو چیرۆکەی قورئانی پیرۆز کە هاوەلانی ئەشکەوتی کهف (خوای گەورە ) دەرگایی رەحمەتیان بۆ دەکاتەوە....؟!**

قال تعالى: ﴿إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ۝١٠﴾ [الكَهۡف : ١٠] واتە : [ إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً ] کاتێك ئەو کۆمەڵە گەنجە باوەڕدارە بۆ پاراستنی دینەکەیان لەدەستی قەومەکەیان رایانکردو چوونە ناو ئەشکەوتەکەوەو وتیان: ئەی پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە ڕەحممان پێ بکە وە بمانپارێزە لە دوژمن و سەرەنجامامان باش بکە [ وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا (١٠) ] وە کارەکەشمان چاك بکە کە ڕائەکەین لەدەست کافران و لێیان دوور ئەکەوینەوە..؟!

[٨٤] - صحيح البخاري برقم (٣٣٠٣).

**بیست و نۆ : دوعاو پارانەوە لە کاتی دە ڕۆژی سەرەتایی مانگی ( ذي الحجة ) :**

**لە (عبدالله کوڕی عباس ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕیتەوە دەلێت: لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی :**

((ما مِنْ أيامٍ العملُ الصالحُ فيهنَّ أحبُّ إلى اللهِ مِنْ هذهِ الأيامِ العشرِ فقالوا يا رسولَ اللهِ ولا الجهادُ في سبيلِ اللهِ فقال رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ ولا الجهادُ في سبيلِ اللهِ إلا رجلٌ خرجَ بنفسِهِ ومالِهِ فلمْ يرجعْ مِنْ ذلكَ بشيءٍ )) . [85]

**واتە: هیچ ڕۆژێ نیە وەك دە ڕۆژی یەکەمی یان سەرتایی مانگی (ذي الحجة) واتە : – نۆمینەی حاجیان – کردەوەی چاکیان تێدا خۆشەویست بێ بەلای (خوای گەورە) ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جیهاد و تێکۆشانیش لە ڕێگەی (خوای گەورە ) ..؟! فەرمووی : تەنانەت جیهاد و تێکۆشانیش لە ڕێگەی (خوای گەورە ) ، مەگەر کەسێ بە خۆی و مال و سامانیەوە بڕوات بۆ جیهاد و خۆی بکوژرێت و مال سامانەکەی بڕوات ..؟!**

**سی یەم : لە کاتی سەفەر کردن یان گەشت کردندا :**

**سی ویەك : لە کاتی نەخۆشی هەژاریدا :**

**سی و دوو : لە کاتی بە ڕۆژوو بوون :**

**سی و سێ : لە کاتی حەج کردندا :**

**سی وچوار : لە کاتی عومرە کردندا :**

**سی و پێنچ : لە کاتی جیهاد و تێکۆشاندا :**

**سی و شەش : لە کاتی ڕۆژی عەرەفەدا :**

**سی و حەوت: دوعای ستەم لێکراوە لە کاتی ستەم لێکردندا :**

**لە (معاذ کوڕی جبل ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەلێت : لە پێغەمبەری خوا ﷺ :**

((واتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فإنَّه ليسَ بيْنَها وبيْنَ اللهِ حِجابٌ )) . [86] **واتە: خۆت بپارێزە لە دوعای کەسی ستەم لێکراو چونکە لە نێوان ئەو (خوای گەورە ) هیچ پەردەیەك نیە ..؟!**

---

[85] -سنن الترمذي برقم (٧٥٧).
[86] - صحيح مسلم برقم (٧٣٧٢).

## دەربارەی ئەو شوێن و جێگایانەی دوعاو پارانەوە گیرا دەبێت :

**یەکەم** : **لەو شوێنەی رجمی شەیتان دەکەی یان لە (الجمرة الصغرى ) و (الوسطى ) و (ايام التشريق ) :**

**لە (عبدالله کوری عمر) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت :** ((أَنَّ رَسولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ كانَ إذَا رَمَى الجَمْرَةَ الَّتي تَلِي مَسْجِدَ مِنًى يَرْمِيهَا بسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّما رَمَى بحَصَاةٍ، ثُمَّ تَقَدَّمَ أمَامَهَا، فَوَقَفَ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ، رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو، وكانَ يُطِيلُ الوُقُوفَ، ثُمَّ يَأْتي الجَمْرَةَ الثَّانِيَةَ، فَيَرْمِيهَا بسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ كُلَّما رَمَى بحَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْحَدِرُ ذَاتَ اليَسَارِ، ممَّا يَلِي الوَادِيَ، فَيَقِفُ مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو، ثُمَّ يَأْتي الجَمْرَةَ الَّتي عِنْدَ العَقَبَةِ ، فَيَرْمِيهَا بسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ عِنْدَ كُلِّ حَصَاةٍ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ ولَا يَقِفُ عِنْدَهَا )) . [٨٧] واته :

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کات ئەو زیخەی یان بردەدەی دەهاوێشت کە دوای مەزگەوت (منى ) یە حەوت دانە زیخ یان بەردی دەهاوێشت ، لە گەل هەر دانەیەکیاندا (تکبیر )ی دەکرد پاشان دەچووە پێشەوە و دەوستاو روو لە قیبلە دەپارایەوە ، دەستەکانی بەرز دەکردەوە زۆر بە پێوە دەوستا ، پاشان دەچوو بۆ (الجمره)ی دووەم حەوت زیخی یان بردی دەهاوێشت ، لە گەل هەر دانەیەکیاندا (تکبیر)ی دەکرد ، پاشان بەلای چەپ دا بەلای دۆلەکەدا لار دەبوویەوە و دادەگەرا ، روو لە قیبلە دەوستاو دەستەکانی بەرز دەکردەوە و دەپارایەوە ، پاشان دەچوو بۆ هاوێشتنی زیخ یان برد هاوێشتنەکەی لای (العقبه ) و حەوت زیخی یان بردی دەهاوێشت و (تکبیر)ی دەکرجد لە گەل هەموو زیخێکدا یان بەردێکدا ، و ئینجا دەرۆیشت و لە لایدا نەدەوەستا.

[٨٧] ـ صحيح البخاری برقم (١٧٥٣).

**دووەم** : دوعاو پارانەوە بە دەوری کەعبە دا :

لە (عبدالله کوری عباس )– خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : ((لَمَّا دَخَلَ النبيُّ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ البَيْتَ، دَعَا في نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، ولَمْ يُصَلِّ حتَّى خَرَجَ منه، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ في قُبُلِ الكَعْبَةِ ، وقالَ: هذِه القِبْلَةُ )) . [٨٨]

واتە : کاتیٚ پیٚغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو کەعبەوە لە هەموو گۆشەیەکدا دوعاو پارانەوەی کردووە ، نویٚژی تیٚدا نەکردووە هەتاکو هاتۆتە دەرەوە ، کاتیٚ کە دەرچوو لە پشتی کەعبە دوو رکات نویٚژی کردووە ، فەرموویەتی : ئەمە قیبلە یە ..؟!

**سیٚ یەم** : دوعاو پارانەوە لە لای (حجر الاسود ) :

**چوارەم** : دوعاو پارانەوە لە لای (رکن الیمانی ) :

لە ( عبد الله کوری عمر )– خوا لیٚ رازی بیٚت – دەلیٚت : ((دَخَلَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ البَيْتَ، هو وَأُسَامَةُ بنُ زَيْدٍ، وَبِلَالٌ، وَعُثْمَانُ بنُ طَلْحَةَ، فأغْلَقُوا عليهم، فَلَمَّا فَتَحُوا كُنْتُ في أَوَّلِ مَن وَلَجَ ، فَلَقِيتُ بلَالًا، فَسَأَلْتُهُ: هلْ صَلَّى فيه رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ؟ قالَ: نَعَمْ، صَلَّى بيْنَ العَمُودَيْنِ اليَمَانِيَيْنِ )) . [٨٩] واتە:

پیٚغەمبەری خوا ﷺ لە گەل (بلال کوری رباح ) و (اسمامەی کوری زید ) و (عثمان کوری طلحة ) – خوا لیٚیان رازی بیٚت – چوونە ژوورەوە فەرمانیدا کە دەرگاکە دابخریٚت ، ماوەیەك تیا مانەوە ، پاشان دەرگاکەی کردەوە ، (عبدالله کوری عمر ) دەلیٚت : من پیٚش خەلکە کە گەیشتمە خزمەت پیٚغەمبەری خوا ﷺ لە کاتیٚکدا دەهاتە دەرەوە ، (بلال کوری رباح ) بە شویٚن یەوە بوو ، ووتم : بە (بلال ) ئایا پیٚغەمبەری خوا ﷺ نویٚژی تیٚدا کرد ..؟! ووتی : بەلیٚ . ووتم : لە کویٚدا ..؟ ووتی : لە نیٚوان هەر دوو پەیە یەمانیە کەدا نویٚژی کرد ..؟!

---

[٨٨]- صحيح مسلم برقم (١٣٣١).
[٨٩]- صحيح مسلم برقم (١٣٢٩).

**پێنچەم** : **دوعاو پارانەوە لە صەفاو مەروە دا :**

**لە (جابر کوڕی عبدالله ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەڵێت :**

((طاف رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وسلَّمَ بالبيتِ سبعًا رملَ منْها ثلاثًا ومشى أربعًا ثمَّ قامَ عندَ المقامِ فصلَّى رَكعتينِ ثمَّ قرأَ وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ورفعَ صوتَهُ يسمعُ النَّاسَ ثمَّ انصرف فاستلمَ ثمَّ ذَهبَ فقالَ نبدأُ بما بدأَ اللَّهُ بِهِ فبدأَ بالصَّفا فرقى عليْها حتَّى بدا لَهُ البيتُ فقالَ ثلاثَ مرَّاتٍ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحدَهُ لا شريكَ لَهُ لَهُ الملْكُ ولَهُ الحمدُ يحيي ويميتُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ فَكبَّرَ اللَّهَ وحمدَهُ ثمَّ دعا بما قدِّرَ لَهُ ثمَّ نزلَ ماشيًا حتَّى تصوَّبت قدماهُ في بطنِ المسيلِ فسعى حتَّى صعِدت قدماهُ ثمَّ مشى حتَّى أتى المروةَ فصعِدَ فيها ثمَّ بدا لَهُ البيتُ فقالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ وحدَهُ لا شريكَ لَهُ لَهُ الملْكُ ولَهُ الحمدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ قالَ ذلِكَ ثلاثَ مرَّاتٍ ثمَّ ذَكرَ اللَّهَ وسبَّحَهُ وحمدَهُ ثمَّ دعا عليْها بما شاءَ اللَّهُ فعلَ هذا حتَّى فرغَ منَ الطَّوافِ )). [٩٠] **واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شاری مەککە حەوت جار بەدەوری کەعبە دا سواریەوە ، لە پاشدا ڕۆیشت بۆ لای مەقامی (ئیبراهیم ) و ئەم ئایەتەی خوێندەوە** (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى ) **جا مەقامی خستە نێوان خۆی و مالی خواوە و دوو ڕەکات سوننەتی تەواف کرد ، ئینجا چوو بۆلای بەردە ڕەشەکە (حجر الاسود ) دەستی هێنا بە بەردەکەدا ، لە پاشدا فەرمووی : دەست پێ دەکەم بەوەی کە (خوای گەورە) دەستی پێ کردووە ، لە صەفاوە دەستی پێ کردو ئەم ئایەتەی خوێند :** قال تعالى: ﴿۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ١٥٨﴾ [البَقَرَةِ : ١٥٨] واتە : [ إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ ] کێوی (صەفاو مەڕوە) ئەمانە دروشمی خوای گەورەن لە کاتی حەج و عومرەدا [ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ ] جا هەر کەسێك حەجی ماڵی خوای گەورەی کرد یان عومرەی کرد [ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا ] ئەوە ئاساییە کە تەواف بکات واتە سەعی بکات لە نێوان (صەفاو مەڕوە)دا، لەبەر ئەوەی لە پێش ئیسلامدا کاتێك خەڵکی مەدینە حەج یان عومرەیان بکردایە بتی خۆیان هەبووە (مەنات)یان هەبووە کە ئەیانپەرست بۆیە پاش هاتنی ئیسلام بەلایانەوە قورس بووە کە بڕۆن سەعی نێوان (صەفاو مەڕوە) بکەن، بۆیە خوای گەورە وای فەرموو، وە ئەم ئایەتەی دابەزاند، بەڵام سەعی نێوان (صەفاو مەڕوە) ڕوکنی حەج و عومرەیشە کەسێك حەجی کرد یان عومری کرد ئەبێ سەعی نێوان (صەفاو مەڕوە) بکات [ وَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ (١٥٨) ] وە هەر کەسێکیش خێرو چاکەی زیاتر بکات و سوننەتەکان جێبەجێ بکات ئەوە خوای گەورە سوپاسگوزارەو پاداشتی زۆر لەسەر کردەوەی کەم دەداتەوە، وە خوای گەورە زۆر زانایە بە چاکەی چاکەکاران..؟!

[٩٠] - سنن الترمذي برقم (٨٦٢).

**شەشەم** : **دوعاو پارانەوە لە لای (المشعر الحرام ) واتە: لە رۆژی قوربانی کردنی حاجی :**

**لە (جابری کوری عبدالله ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دەربارەی حەج کردنی پیٚغەمبەری خوا ﷺ دەلیٚت :**

(( ..... ثمَّ رَكبَ القصواءَ حتَّى أتى المشعَرَ الحرامَ فرقيَ علَيهِ فحمدَ اللَّهَ وَكبَّرَهُ وَهلَّلَهُ فلم يزَلْ واقِفًا حتَّى أسفرَ جدًّا ثمَّ دفعَ قبلَ أن تطلُعَ الشَّمسُ .... )) .[91] واتە: دەربارەی حەج کردنی پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەکە زۆر دریٚژە ، (جابر ) دەلیٚت: پاشان سواری (القصواء ) بوو کە ووشترەکەی بوو ، هەتا گەیشتە (المشعر الحرام ) و رووی کردە (قیبلە) پاشان پارایەوە و (الله اکبر و لا إله إلا وحده لا شريك له ... ی کردو بەردەوام ئاوا بە پیٚوە مایەوە هەتا بە تەواوی دونیا رووناك بوویەوە و پیٚش ئەوی خۆر هەلبیٚت رۆیشت و دەرچوو ....

**حەوتەم** : **دوعاو پارانەوە لە چیایی (عەرەفە ) :**

لە (عمر کوری شعیب ) – خوا لیٚ رازی بیٚت – دە گیٚریٚتەوە دەلیٚت :

((خيرُ الدُّعاءِ يومَ عَرفةَ، وخيرُ ما قلتُه أنا والنَّبيُّونَ من قبلي : لا إلَه إلَّا اللَّهُ وحدَه لا شَريكَ لَهُ، لَهُ الملكُ ولَهُ الحمدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ )) .[92] واتە: پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : خیٚرترین پارانەوە پارانەوەی رۆژی عەرەفەیە ، خیٚرترین پارانەوەی من پیٚغەمبەرانی پیٚش منیش بریتیە لە(( لا إلَه إلَّا اللَّهُ وحدَه لا شَريكَ لَهُ، لَهُ الملكُ ولَهُ الحمدُ وَهوَ على كلِّ شيءٍ قديرٌ)).

[91]- سنن ابن ماجه برقم (٣٠٧٤).

[92]

# حوكمەكانی دوعاو پارانەوە

**یەكەم : حوكمی سەیر كردنە ئاسمان لە كاتی دوعا كردند ..؟!**

**وەلام / زانایان دەلێن : سەیر كردن ئاسامان لە كاتی دوعا وپارانەوە دا دوو حالە تە :**

**یەكەم : ئەگەر لە ناو نوێژ دا بیت ئەوا دورست نیە و حەرامە ..!!**

**دووەم : ئەگەر لە دەرەوەی نوێژ بێت جیاوازی زانایانی لە سەرە ئەمەش دوو حالە تە :**

**١-هەندێك لە زانایان بۆ ئەوە دەچن كە باش نیە سەیری ئاسمان بكەیت لە كاتی دوعا كردن ..!!**

**٢-زۆربەی زانایان بۆ ئەوە چوونە ، كە دروستە ، چونكە هیچ بەلگەیەك نەهاتووە لە سەر رێگری كردن لێی ، بەلكو هەندێك لە زانا بۆ ئەوە چوونە باشتر وایە رووت لە ئاسمان بێت ..!**

**وەلامی / راست ئەوەیە هیچی تێدانیە دروستە ، بەلام نالێن ئاسمان قیبلەی دوعا كردنە ، هەروەك چۆن كەعبەی پیرۆز قیبلەی نوێژی موسلمانانە ، هەلبەتە نوێژ كردنیش جۆرێكە لە دوعاو پارانەوە ، كەواتە لەسەر ئەمە پێویستە لە كاتی دوعاو پارانەوە روو لە قیبلە بێت باشترە و سوننەتە ، بەلام بۆ سەیر كردنی ئاسمان هیچ بەلگەیەكی سوننەت نەهاتووە ، بەلكو فەرمووده هاتووە دەبێت لە دوعا پارانەوەدا رووت لە قیبلە بێت ..؟!**

لە (عبدالله بن زید ) – **خوا لیّ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت :** ((خَرَجَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ إلى هذا المُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَدَعَا واسْتَسْقَى، ثُمَّ اسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ وقَلَبَ رِدَاءَهُ )) . [93] **واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەر بەرەو شوێنی نوێژگە بۆ نوێژەبارانەو داوای باران بارین كرد لە (خوای گەورە ) جا پارایەوە داوایی كرد ، پاشان رووی كردە قیبلە و پۆشاكەكەی بەری هەلگێرایە وە.

[93] - صحيح البخاري برقم (٦٣٤٣).



ئیمام النووي ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (قاضی عیاض دەفەرمووێت: جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان سەبارەت بە کەڕاهەتی سەیری ئاسمان کردن بۆ دوعا کردن لەناو بێجگە لە نوێژ، شورەیح و هەندێک کەسانی تر پێیان باش نەبووە، وە زۆربەی زانایان دەڵێن دروستە) .

(ابن تيمية )-ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (مەکروە نییە سەیری ئاسمان بکەیت کاتی دوعا کردن، لەبەر کردەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئەمە وتەی مالک و شافعی، وە سونەتیش نییە.**"الفتاوىالكبرى" (٥/٣٣٨) .**

ابن عثيمين ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سەیری ئاسمان کردن لەناو نوێژ دروست نییە، بەڵام ئەگەر لە دەرەوەی نوێژ بێت هەندێک زانا بۆ ئەوە چوون باش نییە، بەڵام وتەی ڕاست ئەوەیە مەکروە نییە و هیچی تێدا نییە) .**"فتح ذي الجلال والإكرام " (٢/٥٠٩) .**



## دووەم : حكمی داواكردن لە كەسێك كە دوعای بۆ بكات ..؟

**وەلام / زانایان دەڵێن : لە شەریعەت نەهاتووە داوا لە كەسێك بكەیت دوعاو پارانەوەت بۆ بكات ، بەلكو ئەوە هاتووە دەبێت موسلمان تەنها داوا لە (خوای گەورە ) بكات ، وە بە تنها خۆی داوا لە (خوای گەورە ) بكات نەك داوا لە خەلك بكات ، چونكە دوعا كردن پەرستن یان عبیادەت و زلیلی و خشوع و ملكەچی بۆ (خوای گەورە) ی تێدایە ، وە بە دیار خستنی لاوازی و هەژاری و ترسی بەندەی تێدایە ، هەروەها بەندەش دەبێت پشت بە (خوای گەورە ) ببەستێت بۆ پویۆستیەكانی.**

**چونكە لە شەریعەت دا هیچ نەهاتووە ئاماژەی بۆ ئەوە كردبێت ئیلا دەبێت داوای دوعا لە خەلك بكەیت ، چونكە هەندێك جار داوای دوعا كردن لە خەلك زیانی دەبێت ، ئەویش ئەوەیە دڵ ی پەیوەست دەبێت بەو كەسە كە دوعای بۆ دەكات ، نەك دڵ ی پەیوەست بێت بە (الله تعالى ) كەواتە باشتر وایە موسلمان ئەگەر پێویستیەكی هەبوو با داوا لە (الله تعالى) بكات ، چونكە ئەمە توحید و یەكتاپەرستی تەواو راستە قینەیە ، بۆ ئەوەی كەس نەكات بە واستە لە نێوان خۆی و (الله تعالى )..؟!**

لە (ابن عثيمين ) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: (سوودی فەرموودەکە هەندێک زانا دەکەنە بەڵگە کاتێک دەردەچن بۆ نوێژی باران بارین مناڵ لەگەڵ خۆیان ببەن چونکە هیچ تاوانیان لەسەر نییە و بێ تاوانن، چونکە ئەمە نزیکترە بۆ وەڵام دانەوەی دوعا، ڕووی کردنە بەڵگە: ئەم مێرووە موکەلەف نییە، دەفەرمووێت: "ارجعوا فقد سقيتم بدعوة غيركم".) فتح ذي الجلال والإكرام (٣٠٣/٥).

## سێ یەم: حوكمی داواكردن بە دوعاو پارانەوە واجب و سوننەتە:

**زانایان دەڵێن : داواكردن لە (خوای گەورە ) لە دوو حاڵەتەوە سەیر دەكرێت :**

**یەكەم : تێراوانینی گشتی : لەم رووەوە واجبە یان فەرزە لە سەر موسلمان بەردەوام داوا بكات دوعا پارانەوەی لە پەروەردگاری خۆی ، چونكە دورست نیە بۆ مسلمان هەموو ژیانی ئاوا بمێنێتەوە بێ ئەوەی روو لە (الله تعالى ) بكات و داوای لێ بكات ، یان ئەمە زۆر رینەی حاڵ و بارو دۆخی بێت ، هەر وەك ئەم فەرموودانەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دوعاكردنە ..؟!**

**لە (ابو هريرة ) –خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((مَن لم يسألِ اللهَ يغضبْ عليه)) .[94] **واتە: بەراستی هەر كەسێك دوعاو پارانەوە نەكات یان لە (خوای گەورە ) نەپارێتەوە ئەوا (خوای گەورە) لێی توورە دەبێت..؟!**

**لە (ثوبان موالي رسول الله ﷺ )- خوا لێ رازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((لايُرَدُّ القدرَ إلَّا بالدُّعاءِ ولا يزيدُ في العمُرِ إلَّا البرُّ وإنَّ الرَّجلَ ليُحرَمُ الرِّزقَ بالذَّنبِ يصيبُه )) .[95] واتە : قەزاو قەدر گۆرانی بەسەر نایەت تەنها بە دوعا پارانەوە نەبێت ، تەمەنیش درێژ نابێت تەنها بە چاكە كردن نەبێت ، وە بەندەش رزق رۆزی حەرام دەكات بە گوناهو تاوانی زۆر..؟!

---

[94]- سنن الترمذي برقم (٣٣٧٣).
[95]- ابن حجر العسقلاني هداية الرواة (٤/١١٤).



**له (ابو هريرة ) –خوا لیٚ رازی بیٚت – له پیٚغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (خوای گەورە ) دەفەرموویٚت**

((أنا عندَ ظنِّ عبدي بي، وأنا معه إذا دَعاني)).[96] **واتە: بەندەی من گومانی چۆن بیٚ بەرامبەر به من ، منیش ئەو شیٚوەیە دەبم لەگەلی ، واتە : ئەگەر گومانی باش بوو ئەوا منیش باش دەبم لەگەلی ، ئەگەر گومانی خراپ بوو ئەوە منیش خراپ دەبم لەگەلی ، وە من لەگەلیدام کاتیٚ که لیٚم دەپاریٚتەوە ..؟!**

**دووەم: تیٚروانینی جزئیە : لەم رووەوە سوننەتە ، واتە: سوننەتە مرۆڤ داوا له (اللہ تعالی ) بکات ، چونکه (اللہ تعالی ) فەرمانی کردووە وە دەفەرموویٚت :** قال تعالى: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠﴾ [غَافِر : ٦٠] واتە: تەنها له خوا بپاڕێنەوە [ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ] وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: تەنها لە من بپاڕێنەوە من وەڵامتان ئەدەمەوە [ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي ] ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گەورە ئەزانن لە ئاستی پاڕانەوە لە من و لێم ناپاڕێنەوە [ سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ (٦٠) ] بە دڵنیایی ئەوانە ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە زەلیلی و ڕیسوایی و سەرشۆڕی، (چونکە هەرکەسێك لە خوا نەپاڕێتەوە خوای گەورە لێی تووڕە دەبێت، وە باشترین عیبادەت پاڕانەوەیە لە خوای گەورە، وە چەندێك لە خوا بپاڕێیتەوە زیاتر لێی نزیك دەبیتەوەو خۆشەویست دەبیت).



[96] سننالترمذي برقم (٢٣٨٨).

## چوارەم : حوكمی مسح كردنی دەم و چاو دوای دوعاو پارانەوە كردن :

وەلام / زانايان سه بارەت به مسح كردنی دەم و چاو واته: دەست پێداهێنان دوای دوعاو پارانەوە كردن دەلێن :

أ-دروست نيه مسحی روخسار بكرێت دوای دوعا كردن ، له بەر ئەوەی فەرموودەی متواتر نەهاتووه يان نقل نەكراوه ، چونكه فەرموودەی صحيح لەسەر نيه كه پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای كردووه ، كه مسحی دەم چاوی كردبێت دوای دوعا كردن ..؟!

ب-مسح كردنی دەم چاو به هەردوو دەست دوای دوعا كردن هيچ فەرموودەی صحيح له سەری نەهاتووه جگه له يەك دوو فەرموودەی لاواز نەبێت ، ئەويش نابنه بەلگەی دورست ، (مجموعه الفتاوی ).[97]

[97] -(ابن تيميه ) (مجموعه الفتاوی ) (٢٢/٥١٩).

## پێنچەم : حوکمی دوعا کردن لە ستەمکاران یان ئەو کەسەی زولمت  لێ دەکات:

**وەلام / زانایان دەلێن دورستە دوعا لە ستەمکار بکەیت ئەگەر چی موسلمانیش بێت بە بەلگە ی ئەمانەی خوارەوە :**

**أ–بەلگەی قورئانی پیرۆز ، کە (خوای گەروە ) دەفەرموویێت** : قال تعالى: ﴿* لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلۡجَهۡرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ١٤٨﴾ [النِّسَاء : ١٤٨] واتە : [ لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ ] خوای گەورە بەئاشکرا قسەی خراپی پێ خۆش نیەو خۆشی ناوێ وەکو جوێندان و تانەو تەشەردان ئیلا ئەگەر کەسێك ستەمی لێ کرابێ ئەوە دروستە لای حاکم بڵێ: فلانە کەس ستەمی لێ کردووم و حاڵی خۆی باس بکات گوناهبار نابێ، یاخود خوای گەورە پێی خۆش نیە کەس دوعا لە کەس بکات، مەگەر کەسێك ستەمی لێ کرابێت ئەویش بڵێت خوایە حەقمی لێ بسەنیت، وە ئەگەر ئارام بگرێت باشترە، یاخود وتراوە مەبەست پێی کەسێکە میواندارى نەکرێت و باسی بکات [ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا (١٤٨) ] وە خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە..؟!

لە تفسیری (ابن کثیر ) – **رەحمەتی خوا لێ بێت – داهاتووە لە ( عبد الله کوری عباس) دەربارەی ئەم ئایەتە دەلێت : کە (خوای گەورە) دەفەرموویێت** : ﴿* لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلۡجَهۡرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ١٤٨﴾ [النِّسَاء : ١٤٨] **واتە : دەلێت : (خوای گەورە) پێی خۆش نییە کەسێك دوعا لە کەسێك بکات ، ئەگەر کەسێك ستەم و یان زولم و ناحەقی لە گەل کرابێت ، ئەوە مۆلەت دراوە دوعای لێ بکات لەبەر ووتەی** : قال تعالى: ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ **بەلام دەلێت : ئارام گرتن بۆ خێرترە .**[98]

[98] ـ تفسیر ابن کثیر(١/٥٧٢).



**ب–بەلگە یەکی تر ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ له (ابو هریر ) – خوا لیٚ رازی بیٚت –له پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :** ((ثلاثَةٌ لا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ : الصَّائِمُ حينَ يُفْطِرُ، والإمامُ العَادِلُ، ودَعوَةُ المظْلومِ؛ يَرْفَعُها فَوْقَ الغَمامِ، وتُفَتَّحُ لها أبوابُ السَّماءِ؛ ويقولُ الرب : وعزَّتي لَأنْصُرَنَّكِ ولَوْ بعدَ حِينٍ )) .[99] **واتە: سێ کەس دوعاو پارانەوەیان گیرا دەبێت و نادرێتە دواوە : رۆژووەوان کاتیٚ کە رۆژووە کەی دەشکێنیٚ و بەربانگ دەکاتەوە ، پێشەوای دادپەروەر ، پارانەوەی ستەم لیٚ کراو (خوای گەورە ) بەرزی دەکاتەوە بۆ هەور و دەگای ئاسمانەکانی بۆ دەکاتەوە ، پەروەردگار ، دەفەرمووێت : سوێند بە گەورەیی و شکۆمەنی خۆم ئەی ستەم لیٚ کراو سەرت دەخەم با لە پاش ماوەیە کیش بێت ..؟!**

**ج–بەلگەیەکی تریش لەم فەرموودەیە دا یە :**

**له (معاذ کوری جبل ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەلێت : له پێغەمبەری خوا ﷺ :**

((واتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فإنَّه ليسَ بيْنَها وبيْنَ اللهِ حِجابٌ )) .[100] **واتە: خۆت بپارێزە لە دوعای کەسی ستەم لێکراو چونکە لە نێوان ئەو (خوای گەورە ) هیچ پەردەیەك نیە ..؟!**

**له (ابن باز ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلێت : هیچی تێدانیە دوعا لە کەسێك بکەیت کە ستەم و زولمی لیٚ کردوویت ، بەلام بە قەدەر ستەم و زولمەکەی لیٚ کردوویت ، هەروەك ئەم ئایەتەی (خوای گەورە ) لە قورئاندا فەرموویەتی : قال تعالى:** ﴿۞ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾﴾ [النِّسَاء : ١٤٨] واتە : [ لَا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَنْ ظُلِمَ ] خوای گەورە بەئاشكرا قسەی خراپی پێ خۆش نیەو خۆشی ناوێ وەكو جوێندان و تانەو تەشەردان ئیلا ئەگەر كەسێك ستەمی لێ كرابێ ئەوە دروستە لای حاكم بڵێ: فڵانە كەس ستەمی لێ كردووم و حاڵی خۆی باس بكات گوناهبار نابێ، یاخود خوای گەورە پێی خۆش نیە كەس دوعا لە كەس بكات، مەگەر كەسێك ستەمی لێ كرابێت ئەویش بڵێت خوایە حەقی لێ بسەنیت، وە ئەگەر ئارام بگرێت باشترە، یاخود وتراوە مەبەست پێی كەسێكە میوانداری نەكرێت و باسی بكات [ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا (١٤٨) ] وە خوای گەورە زۆر بیسەرو زانایە..؟!



[99] -سنن الترمذي برقم (٣٥٩٨).
[100] - صحيح مسلم برقم (٧٣٧٢).

## شەشەم : حوكمی دوعا كردن لە ستەمكار بەوەی كە هیدایەت نەدرێت :

وەلام /سەبارەت بەم حوكمە زانایان دەلێن :

١-دوعا كردن لە ستەمكار بەوەی هیدایەت نەدرێت یان (خوای گەورە ) گومراتری بكات یان تووشی تاوانی زیاتر بێت ، بێگومان ئەمە دورست نیە لە رووی شەریعەتەوە ، چونك ئەصل لە دوعا كردن دوعا كردنە بۆ هیدایەت و رێنموویی دانی هەموو خەلك ..!!

٢-واجبە لەسەر موسلمان رقی لە تاوان بێتەوە و پێی ناخۆش بێت و هەولیش بدات زەوی پاك بكاتەوە لە تاوان و گوناهكاری ، وە هەولی ئەوەش بدا رێگری بكات لە خراپەكاری خەلكی دوور بكاتەوە لە خراپە ، یارمەتی خەلك بدات بۆ هیدایەت و رێنموویی و ئامۆژگاری چاكە كاری ..!!

٣-مرۆڤ دەبێت ئاگاداری دوعا كردنی شەرو خراپەكاری بێت ، وە زیادەرەویش نەكات لە دوعا كردن لە ستەمكار، چونكە شەرع نەهی كردووە ..!!

لە (ابو هريرە) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((لَا يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ، ما لَمْ يَدْعُ بإِثْمٍ ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ ، ما لَمْ يَسْتَعْجِلْ قيلَ: يا رَسُولَ اللهِ، ما الاسْتِعْجَالُ؟ قالَ: يقولُ: قدْ دَعَوْتُ وَقَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذلكَ وَيَدَعُ الدُّعَاءَ)) .[١] واتە: بەردەوام دوعاو پارانەوەی بەندە وەردەگێرێت یان قبول دەبێت ، مادەم دوعاو پارانەوەكەی خراپ و گوناه نیە ، یان پچراندنی پەیوەندی خزمایەتی ، یان پەلە نەكردن لەوەلامی دوعا و پارانەوەكەی ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە كردن چیە ..؟!فەرمووی : دەلێ : دوعام كرد دوعام كرد و لێم وەر نەگیرا ، ئەو كاتە واز لە دوعاو پارانەوە دەهێنێت و داوا لە (خوای گەورە ) ناكات ..؟!

قال تعالى: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝٥٥﴾ [الأَعْرَاف : ٥٥] واتە: [ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ] ئێوە لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بە زەلیلی و ملكەچی وە بە نهێنی نەك بە دەنگی بەرزو هاوار كردن [ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٥٥) ] بەڕاستی خوای گەورە ئەو كەسانەی خۆش ناوێ كە سنوور ئەبەزێنن لە پاڕانەوەندا، وەكو داواكردنی كۆشكێكی سپی لەلای راستی بەهەشت، یان داوای شتێكی وا بكەن كە مافی ئەوان نەبێت، یاخود دەنگ زۆر بەرز بكەنەوەو هاوار بكەن لە كاتی پاڕانەوەدا..؟!

[١] -صحيح مسلم رقم (٢٧٣٥).

## حەوتەم : حوكمی كەسێك كە (بووختان ) بۆ كردی ئازاری دای دوعا كردن دروستە..؟!

وەلام / زانایان سەبارت بەمە دەڵێن :

١-بوختان كردن یەكێكە لە تاوانە گەورە كان ن هەر كەسێك بوختانی بۆ كرابوو ئەوە خاوەن مافە كە دەتوانێ لە كەسە كە خۆش بێ ، وە بە پێچەوانەشەوە لێ خۆش نەبێت ..؟! بە شێوەیەكی گشتی لێ بردوون و لێ خۆش بوون باشترە بۆ خاوەن مافە كە ..؟!

٢-دروستە دوعا لە ستەمكار بەكەیت كە ستەمی لێ كردوویت بەم بەلگانەی خوارەوە :

لە (عبداللە كوری عمر ) – خوا لێ رازی بێت – دەلێت :پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا ئەم دوعایەی نە خوێندایە بۆ هاوەلانی لە مجلیسەكان هەلنە دەستا هەتا فەرمووی :(("اللهمَّ اقسِمْ لنا من خَشيتِكَ ما تحولُ به بيننا وبين معاصيك، ومِن طاعتِكَ ما تُبلِّغُنا به جَنَّتَكَ، ومن اليقينِ ما تُهوِّنُ به علينا مصائِبَ الدُّنيا. اللهمَّ مَتِّعْنا بأسماعِنا، وأبصارِنا، وقُوَّتِنا ما أحيَيْتَنا، واجعلْهُ الوارثَ مِنَّا، واجعلْ ثأرَنا على مَن ظَلَمَنا، وانْصُرْنا على مَنْ عادانا، ولا تجعَلْ مُصيبَتَنا في دِينِنا، ولا تجعَلِ الدُّنيا أكبَرَ هَمِّنا، ولا مَبلَغَ عِلْمِنا ، ولا تُسلِّطْ علينا مَن لا يَرْحَمُنا )) .[١٠٢]

واتە: خودایە ئەوەندە بەشمان بۆ دابنێ لە ترس و خۆف خۆت دوورمان بخاتەوە لە گوناهی نافەرمانی تۆ ، لە تاعەت و فەرمانبەرداری ئەوەندە بەشمان بدە كە پێی بگەینە بەهەشتی تۆ ، لە دلنیایی و متمانەش ئەوەندەمان پێ بدە بەلاو ناخۆشیەكانی دونیا بەلامانەوە ئاسان بێ خۆاگربین لە بەرامبەریان ، هەتا زیندووین گوێمان و چاومان و هێز و تواناکمان پێ رەوا ببینە ، لە پاش مردنیشمان بیانكە بە مایەی سوود و قازانج بۆمان ، هەر كەس ستەممان لێ دەكات تۆلەی لێ بسێنە ، هەر كەس دوژمنایەتیمان دەكات سەرمان بخەیت بەسەریدا ، ئایین مان مان تووشی بەلاو ناخۆشی مەكە ، دونیا مەكە بە ئەوپەری هیواو ئاواتمان ، وە مەیكە بە ئەوپەری زانستمان ، ئەو كەسانە زال نەكەی بەسەر ماندا بەزەییان پێماندا نەیەتەوە ..؟!

هەروەك (خوای گەورە ) دەفەرموویێت : قال تعالى: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ [البَقَرَةِ : ١٩٤] واتە : هەر كەسێك كە دەستدرێژی كردە سەرتان ئێوەش دەستدرێژی بكەنە سەری بە هاوشێوەی ئەوەی كە دەستدرێژی كردۆتە سەرتان نەك زیاتر، وە زوڵمیان لێ مەكەن..؟!

لە (جابر كوری عبداللە ) – خوا لێ رازی بێت – دەگێرێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ((اللهمَّ أَصْلِحْ لي سَمْعِي و بَصَرِي و اجعلْها الوَارِثَيْنِ مِنِّي، و انْصُرْنِي على مَنْ ظَلَمَنِي، و أَرِنِي مِنْهُ ثَأْرِي)) .[١٠٣]



---

١٠٢-سنن الترمذي برقم (٣٥٠٢).

١٠٣- صحيح الالباني الادب المفرد (٨٧/٣).

## هەشتەم : حوكمی دوعا كردن بۆ كاربە دەستان :

وەلام / زانایان دەلێن : دروستە دوعا بۆ كاربەدەست بكەیت جا چ موسلمان بێت یان كافر بێت ، چونكە ئێمە فەرمانمان پێكراوە  دوعای خێرو چاكە بۆ كاربەدەستانی موسلمانان بكەین نە دوعایان لێ بكەین ئەگەر چی زولمیش بكەن ، چونكە زولم وستەم كردنیان لە سەر نەفسی خۆیانە ، ئەوە تۆلە كەی لە لای (خوای گەورە)ی لە رۆژی دوایدا ، بەلام خێرو چاكە یان بۆ نەفسی خۆیانە و بە گشتی بۆ ئۆمەتی موسلمانانە ئەوەش پاداشتی گەورەیان دەست دەكەوێن لە رۆژی دوایدا ..؟!

١-زۆرینەی ئەوانەی دەلێن : نابێت دوعا بۆ كاربەدەستان بكەین تووشی فیتنەی تەكفیر بوون ، چونكە ئەمانە كەسانێكن رێبازو مەنهەجیان بە كافر كردنی موسلمانان و زانایان و كاربەدەستانە ، چونكە ئەوانە كەسانێكن زۆر حەزیان لە دەسەلات و فەرمانرەوایی كردنە بۆ قوستنەوەی خۆیان دەست هەلات وەردەگرن و دواتریش پشت لە موسلمانان دەكەن ، لە ربردوودا زۆرێك لەمانە ئەم كارو فرتارانەیان ئەنجامدا خەلكیان تووشی قوربەسەری نەهامەتی دەرد و بەرسیەتی دەربەدەری كرد ..؟!

٢-زانایان دەلێن : كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ كە باسی خەواریجەكانی دەكرد ، ئەوان باسی نوێژەكانیانی دەكرد كە ئەوان بەرێك و پێكی ئەنجامیاندەدا ، بەلام باسی خێر كردن وزەكاتی خەواریجەكانی نە دەكرد ، كەواتە ئەمەش ئاماژەیە كە ئەوان زۆر حەزیان لە مال و سامان فەرمانرەوایی دەسەلاتە ، چونكە مال وسامان دەسەلاتیان لا خۆشەویست بوو ..؟!

لە (ئیمامی النوویی ) رەحمەتی خوا لێ بێت – دوعا كردن بۆ پێشەوایانی موسلمانان و كاربەدەستەكان بۆ چاكە و خێر بۆ ئەوەی (خوای گەورە ) كۆمەك یارمەتیان بدات بۆ ماف و دادپەروەری كردن و خێرو چاكە و فەرمان كردن بە چاك دوور كردنەوە لە خراپە و شتی تر ، یان بۆ بەهێز كردنی ئایینی ئیسلام و سوننەت بەیەك دەنگی هەموو زانایان .[١٠٤]

هەروەها لە (ئیمامی احمد ) – رەحمەتی خوا لێ بێت – نقل كراوە دەلێت : ئەگەر بزانم دوعا كردن قبو دەبێت ئەوە بۆ كاربەدەست دەیكەم .[١٠٥]

---

١٠٤-المجموع (٣٩١/٤).
١٠٥-مجموع فتاوى ومقالات الشيخ ابن باز (٢٠٩/٨).

## نۆیەم : حوکمی دوعا کردن لە ناو سوجدە ..؟!

وەلام / زانایان دەلێن : دوعا کردن لە ناو سوجدە ئەم سیٚ حالە تانە یە :

حالەتی یەکەم : دوعا کردن لە ناو سوجدەی نوێژ جا چ نوێژی واجب و فەرز بێت یان نوێژە سوننەتەکان بێت دروستە

بەم بەلگانەی خوارەوە :

لە ( عبدالله کوری عباس ) – خوا لیٚ رازی بێت – دەگێرێتەوە دەلێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( ألا وإني نهيت أن أقرا القران راكعا أو ساجدا ، فأما الركوع فعظموا فيه الرب عز وجل ، واما السجود فاجتهدوا في الدعاء فقمن أن يستجاب لكم ). [١٠٦] واتە: ئاگادار بن کە رێگری لەمن کراوە قورئان بخوێنمەوە لە رکوع و سوجدە ، لە رکوعدا (خوای گەورە) تێیدا بە گەورە دابنێن ، وە لە سوجدەدا بگەرێن دوعا بکە بە ئارەزووی خۆتان ، شوێنێکی شیاوە بۆ قبول بوونی دوعاو وپارانەوە..؟!

بەلیٚ ئەم فەرموودەیە روون و ئاشکرایە کە سوننەتە دوعا بکەین لە ناو سوجدەی نوێژ دا ، جا چ لە نوێژی واجب و فەرز بێت یان لە نوێژی سوننەت بێت ..؟!

لە (ابن باز ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلێت : ( دروستە ئیماندار دوعا بکات لە ناو نوێژ لە شوێنی دوعا کردن ، جا چ نوێژی واجب بێت یان سوننەت ، شوێنی دوعا کردن لە ناو نوێژ سوجدەیە و کاتی نێوان دوو سوجدە و کۆتایی نوێژ دوایی خوێندنی تەحیات و سلاوات واتە: پێش سەلام دانەوە ... ) [١٠٧]

[١٠٦] -صحيح مسلم برقم ( ٤٧٩ ).
[١٠٧] -مجموعة فتاوى ابن باز ج ١١ .



**حاڵەتی دووەم : دوعا کردن لە سوجدە ڕێگە پێدراوی دەرەوەی نوێژ ، وەك سوجدەی سهو یان سوجدەی قورئان خوێندن یان سوجدەی شکری (خوای گەورە) دەڵێن سوننەت لە م سوجدانەش دوعا بکەیت بە بەڵگە ئەمانەی خوارەوە :**

**لە ( ابو هريره ) – خوا لێ ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :**

(( أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد ، فأكثروا الدعاء )) . [108] واتە: واتە : نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری خۆی ، کاتی سوجدە بردنیەتی ، کەواتە زۆر دوعا پارانەوەی تێدا ئەنجام بدەن ..؟!

**لەم فەرموودەیە دا دوعا کردنی پەیوەست نەکردووە بە سوجدەی ناو نوێژ ، بەڵکو نەی فەرمووە سوجدەی نوێژ ، بە بەڵگە هەر سوجدەیە کە شەرع ڕێگەی دابێت ، کە دەتوانین دوعای تێدا بکەین ، ڕاستە فەرموودە یەکەم واتە : فەرموودەکەی (کور عباس ) باسی سوجدەی ناو نوێژدەکات ، وە هەندێك لە زانایانی فەرموودە دەڵێن : ئەم فەرموودەیەش باسی سوجدەی ناو نوێژە ، بەڵام ڕێگری نیە لە ناو سوجدە کە ڕێگەی پێدراوە دوعا بکەین ..؟!**

**حاڵەتی سێیە م : دوعا کردن لە سوجدەی ڕێگە پێنەدراو لە دەرەوەی نوێژە ، وەك : کەسێك سوجدەیەك دەبات بێ هۆکار تەنها سوجدە دەبات بۆ دوعا کردن دوای نوێژ ، زانایان دەڵێن : ئەمە دروست نیە و بیدعەیە ، بەم بەڵگانەی خوارەوە :**

**١–ئەصل وایە عبیادەت (توقيفيه ) واتە: ڕاوەستانە نابێت لە خۆتەوە عبیادەت بکەیت ئیلا بەڵگەی هاتبێت ، هیچ بەڵگە نەهاتوون کەواتە نابێت .**

**٢–پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (( من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد )) . رواه مسلم . واتە : هەر کردەوەیەك بکەی فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێت ، ئەوا ئەو کردەوەیە ڕەت دەکرێتەوە .**

**٣–قیاس دەکەن لەسەر ڕکوع ، هەموو زانایان یەك دەنگن کە حەرامە ڕکوع بە تەنیا ببەیت ، وە سوجدەش بە تەنیا هەمان شێوەیە ، واتە : نابێت بێ هۆکارو بێ بەڵگەی شەرعی ڕکوع ببەیت ، وە بێ هۆکارو بێ بەڵگەی شەرعی سوجدە ببەیت ، ئیلا ئەو شوێنانەی کە ڕێگە پێدراوە ڕکوع و سوجدەی تێدا ببەی ..؟!**



[108] - صحيح مسلم برقم (٤٨٢).

## دەیەم : حوکمی دوعا کردن جگە لەزمانی عەرەبی :

وەلام / جیاوازی هەیە لە نێوان زانایان سەبارەت بە دوعا کردن لە لە ناو نوێژ دا بێجگە لە زمانی عەرەبی سیٚ راو بۆچوونی جیاواز هەن :

یەکەم : هەندێك لە زانایان دەلێن : حەرامە ، ئەمە ووتەی (ئیمامی مالك) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – بەم بەلگەیەی خوارەوە:

–چونکە نەفی بە گەورە دانان دەکات ئەو گەورەییە نامێنێت .

دووەم : هەندێك زانا دەلێن : باش نیە ، ئەمە ووتەی (ئیمامی ابو حەنیفەیە ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – بەم بەلگەیەی خوارەوە:

–هیچ بەلگەی روون نەهاتوون کە حەرام بێت ، بەلکو (عمر ) نەهی کردووە ئەم نەهی یە بۆ کەراهەتە .

سیٚ یەم : هەندێك زانا دەلێن : دروستە ، بۆ کەسێك کە تونای نیە ، بەلام ئەگەر تونای هەبێت و بزانێت بە بێجگە لە عەرەبی دوعا بکات نوێژی بەتالە ، کە ئەمە ووتەی (ئیمامی احمد کوری حنبل ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – .

بەلام زانای سەردەم (ابن عثیمین ) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەلێت : ( دوعا کردن بە زمانی بێجگە لە عەرەبی دروستە جاچ لە دەرەوەی نوێژ بێت یان ناوەوەی نوێژ بێت ، چونکە ئەو پیاوەی زمانی عەرەبی نازانێت ئەگەر تەکلیفی لیٚ بکریچت بۆ زمانی عەرەبی وەوە داوا لیٚ کراوە بەلام لە شتێك لە توانایدا نییە ...)

کەواتە: زۆربەی زانایان دەلێن : دروست نیە دوعا بکەیت بە زمانی بیجگە لە عەرەبی لە ناو نوێژ ، هەندێك جیاوازیش دەخەنە نێوان نوێژی واجب و نوێژی سوننەت ...؟!

